

غەیبەت؛ بەڵای گەورەی زمان

نووسینی: فاروق چەتین
وەرگێڕانی: دەستەی وەرگێڕانی دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
چاپی یەکەم: تشترینی یەکەم - ٢٠١٥
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٥٨١)ی ساڵی (٢٠١٥)ی پێدراوە
تیراژ: ٣٠٠٠
شوێنی چاپ

Neşe
Basım-Yayım

Neşe Matbaacılık - İstanbul - TURKEY
+90 212 886 83 30
www.nesematbaacilik.com



دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
www.irfanpublishing.com

گوندی ئینگلیزی خانووی ژمارە ٩ / هەولێر
+964 (0) 750 713 80 00

# پێڕستی بابەتەکان





Scanned by TapScanner

بەڵام دەسیسەکانی شەیتان زۆرن و زۆربەی کاتیش ژەهر لە بەرگی هەنگوینندا دەرخواردی مرۆڤ دەدەن. زۆر جاریش مرۆڤ بە بیانووی وتنی "من بۆ ڕاست دەڵێم"، هەڵدەخەڵەتێت. بەڵام لە ڕاستیدا ئەوەی دەدوێ نەفسمانە و ئەوەش کە دەمانهێنێتە گۆ شەیتانە. مرۆڤ بێ ئەوەی بەخۆی بزانێت کاتێك زمانی دەداتە دەست ئەم دوو دوژمنە سەرسەختەی، دەکرێ ئەنجامگەلی هێندە خراپ بێنە ئاراوە، کە بەرلێگرتنیان کارێکی گەلێك سەخت بێت. هەر بۆیە وتراوە "برینی شمشێر ساڕێژ دەبێت، بەڵام ساڕێژ بوونی برینی زمان ئەستەمە".

زمان برینی بە سوێ جێ دەهێڵێت. برینێکی وا دروست دەکات، بەجۆرێك لە دواڕۆژیشدا ئازارەکەی بەردەوام دەبێت. دەکرێت مرۆڤ بە تەنها چەند وشەیەك غەیبەتی کۆمەڵگەلی هێندە گەورە بکات، بە جۆرێك گەر هەموو تەمەنیشی یەك یەك بەدوای ئەو مرۆڤانەوە بێت تا گەردنی خۆیان پێ ئازاد بکات، هێشتا پێیان ڕاناگات.

وتراوە "گوفتار هەیە جەنگەکان دەکاتە ئاشتی، گوفتاریش هەیە مل دەپەڕێنێت". بەڵێ، غەیبەت گوفتارێکی گەلێك مەترسیدارە، گەر وازی لێ نەهێنرێت ئەوا لە مەحشەردا سەری خاوەنەکەی دەخوات.

وەك چۆن تیری لە کەوان دەرچوو و فیشەکی لە لوولە دەرچوو گەڕانەوەیان نییە، بە هەمان جۆر وتەی لەدەم دەرچووش گەڕانەوەی نییە. گەر مرۆڤ نەیەوێت لە دواڕۆژدا بچێتە ژێر باری قورسایی و لێپرسینەوەیەك کە لە توانایدا نەبێت لە ئەستۆی بگرێت، ئەوا پێویستە

جڵەوی زمانی بگرێتە دەست و بڕیار بدات ئەو زمانەی کە بۆ یادی خوا پێی بەخشراوە، بۆ باسکردنی پاشەملەی ئیمانداران بەکاری نەهێنێت.

لەو باوەڕەدام سەرجەم ئەو ئازیزانەمان کە ئەم کتێبە دەخوێننەوە، بە کینەیەکی زیاترەوە لە غەیبەت کە ڕەوشتێکی ناشایستەیە بۆ ئیماندار، دوور دەکەونەوە و دووبارە بەڵێن دەدەنەوە کە زمانیان بە پاکی و بێ وەیی بپارێزێت.

خوای گەورە هەموومان بکاتە ئەمینی ئەمانەت هەتا ئەو ڕۆژەی ئەمانەتەکەمان دەسپێرینەوە بە خۆی.

٢٠١٠/٠١/٢٠

**سەید نورفەتحی ئەرکال**

# زمان:
# کلیلی بەهەشت، یان خۆڵەمێشی دۆزەخ



"مرۆڤ بە گوێگرتن عاقڵ دەبێت،
بە قسەکردن پەشیمان دەبێتەوە"
پەندی پێشینان

زمان لە فەرهەنگدا بەو ئەندامە گۆشتنە درێژە جووڵەدارە ناودەبرێت کە لە نێو بۆشایی دەمدایە و فەرمانەکانی تامکردن و هەڵاوێرکردنی خۆراکەکان و قووتدانیان و بەشێك لە دەرکردنی دەنگ جێبەجێ دەکات. ئەم ئەندامە لە زۆرێك لە گیاندارەکانی سەر زەویدا هەیە، بەڵام زمانی مرۆڤ لە زمانی ئەوانی دی زۆر جیاوازە. لەبەر ئەوەی مرۆڤ لەڕێگەی ئەم ئەندامەوە هەستەکانی دەردەبڕێت، بەهۆی ئەوەوە جیهانی ناوەوەی دەکاتە دەنگ و گوفتار و وەك هۆکارێکی پەیوەندی لەگەڵ مرۆڤەکانی دیدا بەکاری دەهێنێت. زمان ئەندام و توانستێکی هێندە هەستیار و گرنگە کە خوای مەزن لە یادخستنەوەی ئەو

نیعمەتانەدا کە بە گرۆی مرۆڤی بەخشیوە، ئاماژەی تایبەتی بە "دەربڕین" ﴿عَلَّمَهُ الْبَيَانَ﴾ (الرحمان: ٤) و "زمان" ﴿وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ﴾ (البلد: ٩) کردووە.

دەکرێت بڵێین کە نهێنی وردی بەدیهێنانی مرۆڤ، لە توانستی دەربڕینیدایە. ئەو گیاندارەی کە ناوەکانی خوای گەورە لە سینە دەگرێت و بە جوانترین شێوە هۆنراوەی "أسماء الحسنى" بە سروود دەچڕێت، بێگومان مرۆڤە. سەرجەم گرۆی مرۆڤایەتی بەم نیعمەتە سەرفراز کراوە و تەنانەت فریشتەکانیشی بەم توانایەی سەرسام کردووە. کاتێکیش پێغەمبەران تاجی نبووەتیان لەسەر نرا، لەسایەی نیعمەتی دەربڕین و زمانەوە توانیان ڕاستییە ئیلاهییە دابەزیوەکانی خوای گەورە بگەیەنن بە مرۆڤایەتی و ئەو کتێبانە بۆ مرۆڤایەتی بخوێننەوە کە بۆیان دابەزیوە، هەر لەو سایەیەدا کارێکی وایان کرد کە ئوممەت سوود لە هەموو ئەمانە ببینێت. ئەمە نیعمەتێکی هێندە بەنرخە کە توانامان بۆ خوێندنەوە و تێگەیشتن لە قورئانی پیرۆزیش هەر لە ڕێگەی خاوەندارێتی ئەم توانستانەوە بووە. بۆیە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێت "خوای گەورە لە هەموو شت زیاتر بەوە خۆشنوود دەبێت کە گوێبیستی پێغەمبەرێکی دەنگ خۆش بێت کاتێك قورئان بە دەنگەوە بە شێوازێکی کاریگەر و لە ناخەوە دەخوێنێت"[١]، بەم جۆرە سەروەرمان ئاماژە بە پێگەی تایبەتی ئەو پێغەمبەرە دەکات لەلای خوا، کە قورئانی پیرۆز بە شێوازێکی جوان دەخوێنێت. زمان، وەك مانا بە ژیانی مرۆڤ دەبەخشێت، ئەو هێزەشە کە لە ژیانی دوارۆژدا دەرگاکانی بەهەشتی بۆ دەکاتەوە و دەرگاکانی دۆزەخیی بە ڕوودا دادەخات.

١. البخاري، فضائل القرءان ١٩؛ مسلم، صلاة المسافرين ٢٣٢.



Scanned by TapScanner

وشەی "توحید" کە مرۆڤ لە دڵیدا پەسەندی دەکات و لە ڕێی زمانیەوە دەریدەبڕێت، دەرگاکانی بەختەوەری هەمیشەیی تا کۆتایی بەڕوویدا والا دەکات. لە بەرامبەر ئەمەدا کاتێك ئەو، لەجیاتی ئەوەی ئەم هێزە لە خێر و ڕاستەڕێی ویستی خوای گەورەدا بەکاربهێنێت، بە ناڕاستەی ویستی ئیبلیس بەکاری هێنا، لە بەهەشت دوور دەکەوێتەوە و لە دۆزەخیش نزیك. کاتێك ئەم ئەندامەی نێوان لێوەکانمان لە جێی خۆیدا بەکار هێنرا، ئەوا دەبێتە کلیلی دەرگای خێر، ئەگەر بەو ناڕاستەیەشدا بەکار نەهات ئەوا دەبێتە ئامێرێکی شوومی بەرهەمهێنانی گوناهـ. زمان و توانستی دەربڕین ئەو دوو هێزەن کە دەتوانن مرۆڤ بەرەو بەرزترین پلە (أعلی العليين) ببەن و گەر خراپیش بەکارهێنران بەرەو نزمترین پلە (أسفل السافلين) نزمی بکەنەوە و ڕیسوای بکەن، بۆیە دەبینین لە زاری حەزرەتی ئادەمەوە (عَلَيۡهِ السَّلَام) ئەم دەربڕینە هاتە دەر:

﴿ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴾

(الأعراف: ٢٣)

"ئەی خوای پەروەردگار!، ئێمە ستەممان لە خۆمان کرد، ئەگەر تۆ لە گوناهمان خۆش نەبیت و ڕەحممان پێ نەکەیت، لە زومرەی زیانباران دەبین."

کەچی لە زاری ئیبلیسی نەفرەتلێکراوەوە ئەم دەربڕینە لووتبەرزانەیە دێتە دەر:

﴿ قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسۡجُدَ إِذۡ أَمَرۡتُكَۖ قَالَ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ ﴾ (الأعراف: ١٢)

"من باشترم لەو، منت لە ئاگر دروست کردووە کە نوورانی و ڕووناکە و، ئادەمت لە قوڕ دروست کردووە کە بێ نوور و تاریکە!".

پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيم) لەم باسەدا ئەم مژدانەمان پێدەدا و دەفەرموێت "هەندێك جار مرۆڤ بێ ئەوەی بە بیریدا بێت کە بەو هۆیەوە دەگاتە ڕەزامەندی خوای گەورە، شتانێك دەڵێت کە خوای گەورە پێی خۆشن، خوای مەزنیش بە هۆی ئەو دەربڕینەیەوە تا ڕۆژی دوایی لەو بەندەیەی خۆش دەبێت"[1]. هەروەها دەفەرموێت "هەندێك جار مرۆڤ بێ ئەوەی هەستی پێبکات شتێك دەڵێت کە خوای مەزن خۆشنوود دەکات، خوای مەزنیش پلەی ئەو بەرز دەکاتەوە"[2].

بۆ ئەوانەش کە وریای ئەوەنین کۆتای ئەو قسەیەی دەیکەن بەرەو کوێ دەڕوات و هەڵگری هەستیاریی یەکی وەها نین، دەفەرموێت "کەسێکیش بێئاگایانە قسەیەك لە زاری دەردەچێت کە داخوازی تووڕەیی خوای گەورەیە. بۆیە بە هۆی ئەو وتە خراپەی لە زاری دەرچووە، تا ڕۆژی دوایی دووچاری تووڕەیی خوای گەورە دەبێت"[3]، هەروەها دەفەرموێت "مرۆڤ بێ ئەوەی بە باشی بیر بکاتەوە وتەیەك لە زاری دەردەچێت و بەم هۆیەوە دەکەوێتە شوێنێکی وەهای دۆزەخ کە گەورەترە لە دووری نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا"[4].وە دەفەرموێت "بەندەیەك بێ ئەوەی بایەخی پێبدات، قسەیەك لە زاری دێتە دەر کە

---

١. الموطأ، كلام ٥؛ الترمذي، الزهد ١٢. جگە لەمە تەماشای ئەمەش بکە: إبن ماجة، فتن ١٢.

٢. البخاري، الرقاق ٢٣؛ جگە لەمە تەماشای ئەمەش بکە: الالترمذي، الزهد ١٠ ؛ إبن ماجة، فتن ١٢.

٣. الموطأ، كلام ٥؛ الترمذي زهد ١٢، جگە لەمە تەماشای ئەمەش بکە: إبن ماجة، الفتن ١٢.

٤. البخاري، الرقاق ٢٣؛ مسلم، الزهد ٤٩، ٥٠.

داخوازی تووڕەیی خوای گەورەیە و خوای گەورەش بە هۆی ئەم قسەیەیەوە فڕێیدەداتە بنی دۆزەخەوە."[1]

پێغەمبەری خوا بەم ڕستانەی هۆشداریمان پێدەدات و ئەوەمان بەبیر دەهێنێتەوە کە پێویستە ئەو وتانەی لە زارمان دەردەچن لە پێشدا گوێی دڵمان بیبیستێت.

توانستی دەربڕین و گوفتار ئەمانەتێکی خوای گەورەیە بۆیە پێویستە وەك نیعمەتەکانی دی لە ڕێگەی ئەودا بەکار بهێنرێت و نەخرێتە خزمەتی ڕەفتارە نابەجێکانی وەك کوفر و درۆ و دووبەرەکی و غەیبەت و باسکردنی پاشەملە و قسەهێنان و بردن پوختەی قسە ئەوەیە، پێویستە چەندین جار بیر بکەینەوە ئینجا بدوێین.

## ئەوەی ئاگای لە زمانی بوو ڕزگاری بوو[2]

دوورکەوتنەوە لە قسەی پاشەملە، هۆکاری ڕزگاربوونە. هەروەها پاراستنی زمان لە قسەی خراپ، یەکێکە لەو ڕەفتارە بەرزانەی کە خوای مەزن زۆری پێخۆشە. خوای گەورە بە ڕەحمەتی خۆی مامەڵە لەگەڵ ئەو کەسانە دەکات کە جڵەوی زمانیان دەکەن و بەردەوام ڕێککاری تێدا ئەنجام دەدەن. بەئاگابوون لە گوفتار، بیرکردنەوەی هەزار جارە پێش هەر دەربڕینێك و هۆشداربوون لەوەی "ئایا نووکی

---

١. البخاري، رقاق ٢٣، جگە لەمە تەماشای ئەمەش بکە: الترمذی، الزهد ١٠؛ إبن ماجة، الفتن ١٢.

٢. الترمذی، القيامة ٥٠، سنن الدارمي، الرقاق ٥.

قسەکەم بەرەو کوێ دەڕوات؟"، دروشمی ئیماندارانە. قسەی زۆر و بێکەڵك دەبێتە مایەی نائومێدی دڵ و ماندوێتی جەستە و بێبەشبوون لە ڕۆزی. ئەو بابایانەی بێشومار و بێناگایانە قسەدەکەن، بەم کارەیان ژیانی هەمیشەییان دەخەنە مەترسییەوە. ئەمە لە کاتێکدا "بەها و قەدری مرۆڤ بە قسەی زۆر زیاد ناکات"، بەڵکو بەهای مرۆڤ بەندە بەوەی تا چەندێك ئەو قسەیەی دەیکات بەسوودە و لە جێی خۆیدایە. بە پێچەوانەوە، گەر کەسێك لە هەموو جێیەك و دەربارەی هەموو بابەتێك بە ڕاست و چەپدا بدوێت، بە تایبەت گەر ئەو شتانەی کە لێیان دەدوێت پەیوەندیدار بن بە چەمکە مەزنەکان و ئەو بابەتانەی پسپۆرییان پێویستە، ئەوا بێگومان دەکەوێتە چەندین هەڵەوە و لە بەهای خۆیشی کەم دەکاتەوە. ئەو وتەیەی کە دەڵێت "ئەوەی زۆر قسە بکات ناتەواویی زۆری دەبێت"[1]، چ وتەیەکی پڕبایەخە.

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەفەرموێت "کێ بەڵێنی پارێزگاریکردنی نێوان لێوەکانی (زمان) و نێوان هەردوو ڕانیم (داوێنی)پێبدات، منیش بەڵێنی بەهەشتی پێدەدەم"[2]، "ئەو کەسەی خوا لە بەڵای نێوان لێوەکانی و نێوان ڕانەکانی بیپارێزێت، دەچێتە بەهەشتەوە"[3]. لەم دوو بابەتەدا داوای گەرەنتی لە ئیمانداران دووپات کراوەتەوە. گەر ئیمانداران لەم بابەتانەدا پابەند بن بە گوفتاری پێغەمبەری خواوە، ئەویش لە ڕۆژی دواییدا هاوکارییان دەکات و

---

١. م.فەتحوڵلا گولەن، پێوانە یاخود ڕوناکیەکانی سەر ڕێ.

٢. البخاري، الرقاق ٢٣.

٣. الترمذي، الزهد ٦١.

دەستیان دەگرێت و بە ویستی خوای گەورە بەرەو بەهەشتیان دەبات.

ئەوانەی لە دونیادا پارێزگاری لە دەست و داوێن و زمانیان دەکەن، بە ئاسانی لە لێپرسینەوەی دوارۆژدا تێپەڕ دەبن. بێگومان لێپرسینەوەی ئەوانە ئاسان دەبێت کە کورت و پوخت دەدوێن. ئەو دەربڕینەی خوای گەورە کە دەفەرموێت:

﴿ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴾ (ق: ١٨)

"ئادەمیزاد قسەیەك چییە نایكات ئیللا فریشتەیەكی چاودێریکەری ئامادە بۆ نووسینی لە لاوەیە هەرچی بە دەمادا بێت هەمووی لای خۆی دەنووسێ".

بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە هەر وشەیەك لە زاری ئادەمیزاد بێتە دەرەوە ڕاستەوخۆ تۆمار دەکرێت و هەواڵمان پێدەدات کە هەر یەك لەو قسانەی کراون، لە کاتی خۆیدا لێپرسینەوەیان لەسەر دەکرێت. کاتێك سوفیانی کوڕی عەبدوڵلا (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) پرسیاری لە پێغەمبەری خوا کرد دەربارەی ئەو شتەی کە لە هەموو شتێك زیاتر خەمیەتی، پێغەمبەرمان لە وەڵامدا بە دەستی موبارەکی ئاماژەی بۆ زمانی کرد و فەرمووی "ئەمەیە!"[1]، بەم جۆرە بە بیری هەمووانی دەخستەوە کە پێویستە لەمەڕ گوفتاریان هەستیارانە مامەڵە بکەن.

ئەو قسە بێ بنەما و مەبەستانەی کە دوورن لە "صوحبەتی جانانە"[2]، و بۆر بەفیڕۆ دەدەن، گەر لەم خەوی غەفڵەتە بەئاگا نەیەن، ئەوا لە

١. الترمذی، زهد ٦١؛ جگە لەمە تەماشای ئەمەش بکە: إبن ماجة، الفتن ١٢.

٢. قسە و گفتوگۆیەك کە یادی پەروەردگاری تێدابێت.

خوای گەورە دوور دەکەونەوە و مەحکومی ژیانێکی بێ بەرەکەت و بێ ڕەحمەت دەبن.[1] خوای گەورە هەموولایەکمان بپارێزێت لە تلانەوەی نێو ئەم جۆرە غەفڵەتەدا.

## مرۆڤ لە دڵ و زمانی پێکدێت

زمان ئەو ئەندامەیە کە دەنگ دەبەخشێتە ئەوانەی دڵ بەرهەمیان دێنێت. دڵ چۆن داوا لە زمان بکات، زمانیش بەو جۆرە دێتە گۆ. پێشینانمان ئاماژە بەم ڕاستییە دەدەن و دەڵێن "پیسبوونی زمان بەهۆی پیسبوونی دڵەوە دەبێت. گەر دڵ خراپ نەبێت زمانیش خراپ نابێت".

سەرجەم ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە ژێر مەترسی زمان و دووچاری ئەم تایبەتمەندییە ئازاربەخشەی ئەو دەبن.[2] لەبەر ئەمە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا دەفەرموێ "مرۆڤ کاتێك بەیانی بەسەردادێت هەموو ئەندامانی جەستەی ڕوودەکەنە زمان و پێی دەڵێن "لە پاراستنی مافی ئێمەدا لە خوا بترسە. ئێمە تەنها بەبۆنەی قسەکانی تۆوە سزا دەچێژین. ئێمە بە تۆوە بەستراوین. ئەگەر تۆ ڕاسترەو بیت، ئێمەش وەها دەبین. ئەگەر تۆش بچەمێیتەوە و لە ڕێ لابدەیت، ئێمەش شوێن تۆ دەکەوین و وەك تۆمان لێدێت."[3] ئەم فەرموودە

---

١. الترمذی، الزهد ٦٢.

٢. أبو يعلى، المسند ١/١٧.

٣. الترمذی، الزهد ٦١.

پیرۆزە پێمان ڕادەگەیەنێت کە زمان ئەندامێکی چەند کاریگەرە لەسەر جەستەی مرۆڤ.

پێشینان وتویانە "ئینسان واتە ئوسلوبی بەیان! (مرۆڤ واتە شێوازی دەربڕین)." قسەکردنی مرۆڤ سەرەداوی گرنگ دەربارەی کەسایەتی و جیهانی ناوەوەی ئەو مرۆڤە دەخاتە ڕوو. گەر حیکمەت لە دڵدا هەبێت ئوسلوبیش حەکیمانە دەبێت، گەر زوڵمەتیش لە دڵدابێت ئوسلوب نەشیاو دەبێت و ڕووخێنەر و بێزراو دەبێت. ئەوانەی دڵیان بە پاکی ڕاناگرن، زمانیشیان بە پاکی نامێنێتەوە. ئەوانەی دڵیان بە یادی خوا دەدرەوشێننەوە، دڵۆپی حیکمەت لە زاریان دێتە خوار. ئەوانەش کە گومانی خراپ و غەیبەت و بیری دووبەرەکی دڵی داگیر کردوون، ژەهر لە زاریان دەتکێت. ئەمانە بار و شەرەف و نامووس و دڵی مرۆڤ دەگەزن، دەیگەزن و بەم کارەیان غەزەبی خوای گەورە بۆخۆیان دەهێنن. لە بەرامبەر ئەمەشدا ئەو ئیماندارانەی ئاگایان لە مایەی دڵ و زمانیانە و بەردەوام چاودێری ئاستی مەعنەوی ئەو شتانەی سەرەوە دەکەن، وەك موگناتیسێك ڕەحمەتی ئیلاهی بۆ سەر خۆیان ڕادەکێشن.

گەر کرۆك نارێك بێت، گوفتاریش نارێك دەبێت. وەك چۆن دڵ ئاوێنەی زمانە، زمانیش ئاوێنەی دڵە. چۆن دڵێکی ڕەش لە ڕێی زمانەوە بە قسەی ناخۆش و بێزراو چواردەوری خۆی بێزار دەکات و زاری دەکاتە تەرجومانی ناشرینییەکانی خۆی؛ زمانێکیش کە بێ ڤیزە و بە ڕاست و چەپدا بێ گوێدانە حەرام و حەڵاڵ هەموو دەستەواژەیەك بەکاربهێنێت، ئەوا دوور نییە ببێتە هۆکاری زیادبوونی

ناڕەحەتی مەعنەوی و دووچاربوون بە دارِمان. سروشتی ئەم دوو ئەندامەی جەستە وەهایە کە یەکدی پڕدەکەن و هانی یەکدی دەدەن بۆ خراپە. بێگومان گەر لە لایەنی ئەرێنییەوە تەماشای ئەم کاریگەرییە دوولایەنییە بکرێت، دۆخەکە تەواو پێچەوانە دەبێتەوە. زمانێک کە تەرجومانی دڵێکی باشە، ئەو جوانییانەی دەریاندەبڕێت کار لە دڵیش دەکەن. ئەم دوو ئەندامەی جەستە وەك دوو هاوڕێی گیانی بە گیانی وەهان. چۆن هاوڕێ خراپەکان لە کاری خراپدا یەکدی هاندەدەن، هاوڕێ باشەکانیش لە باشەدا کار لە یەکدی دەکەن و لە ڕێگەی خێردا هاندەری یەکدی دەبن. ئەوەتا پێغەمبەری خواش (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بە دەربڕینێکی کورت و پوخت ئەم پەیوەندییەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە "گەر مرۆڤ دڵی ڕێك نەبێت، ئیمانی ڕێك نابێت. تا زمانیشی ڕێك نەبێت، خاوەن دڵێکی ڕێك نابێت."[1]

دەگێڕنەوە جارێکیان حەزرەتی داود (عَلَيْهِ السَّلَامُ)، داوا لە حەزرەتی لوقمان دەکات مەڕێك سەرببڕێت و دوو پارچە گۆشت لە باشترین شوێنی مەڕەکە لێبکاتەوە و بیهێنێت؛ حەزرەتی لوقمانیش زمان و دڵی ئاژەڵەکەی هێنا. پاش ماوەیەك حەزرەتی داود داوای لێکرد دوو پارچە لە خراپترین شوێنی ئاژەڵێك بهێنێت، ئەمیش دووبارە دڵ و زمانەکەی هێنا. کاتێك حەزرەتی داود هۆکاری هێنانی ئەم دوو پارچەیەی لێ پرسی لە هەردوو جارەکەدا، حەزرەتی لوقمان بەم جۆرە وەڵامی دایەوە "گەر ئەم دووانە باش بن، لەمانە باشتر نییە، گەر خراپیش بن، لە خۆیان خراپتر نییە."

---

١. أحمد بن حنبل، المسند، ١٩٨/٣.

بۆیە لە دەرگانەی میهرەبانی بێهاوتای قسەکەری ئەزەلیدا دەپاڕێینەوە تا هەردەم دڵ و زمانمان بە یادی خۆیەوە سەرقاڵ بکات. خوایە هەموومان بخەیتە ڕیزی ئەوانەی زمانیان دەگرن و ڕزگاریان دەبێت.

## یان قسەی خێر بکە، یان بێدەنگ بە...

پێغەمبەرمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێت "با ئەوەی بڕوای بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە، یان قسەی خێر بڵێت یا بێدەنگ بێت!"[1] وانەیەکی ناوازەمان لە ڕەوشتی قسەکردن فێر دەکات. لە ژیانی ئەودا دەستەواژەیەك بەدی ناکرێت لە جێی خۆیدا نەبێت و بێهودە بەکارهاتبێت. کاتێك سەرداری بونەوەران دەدوا، وشەکان لە زاریەوە وەك مرواری دەهاتنە خوارەوە. ئەو وشەکانی بە هەستیاریی زێڕینگەرێکەوە بەکار دەهێنا و هەرگیز وشەیەکی لە زیادە بە فیڕۆ نەداوە. کەم دواوە بەڵام لە جێی خۆیدا دواوە. ئەم ڕەفتارە لە ئاکاری ڕاستگۆترین دۆست و دڵسۆزترین شاگردی سەردارماندا کە حەزرەتی ئەبوبەکرە، بە تەواوی ڕەنگی دابووەوە. ئەو سەرەڕای ئەوەی ساڵانێکی زۆر هاوڕێ و هاودەمی سەردارمان بووە، کەچی ئەو وشانەی لە زاری هاتوونەتە دەرەوە گەلێك سنووردارن. هاوەڵان پیاوانێکی هێندە مەزن بوون کە زۆربەی جار بە زمانی "حاڵ" لێکدەگەیشتن و پێویستیان بە زمانی "قاڵ" نەدەکرد. مەبەستەکانیان بە وەستان و ئاماژەی ڕوخساریاندا بەدیار دەکەوت، سیمایان دەبووە

---

١. البخاري، الأدب ٣١، ٨٥، الرقاق ٢٣؛ مسلم، الإيمان ٧٤. جگە لەمە تەماشای ئەمەش بکە: أبو داود، الأدب ١٢٣؛ الترمذي، القيامة ٥٠.

ناوێنەی دڵەکانیان. وشەکانیان دەستپێوەگرانە بەکار دەهێنا، کاتێکیش بەکاریان دەهێنا وەك ئەوەی خشتێك بخەیتە جێی خۆی، لە جێی خۆیدا ئەو وشەیەیان دادەنا. لەم ڕوانگەیەوە دەکرێت بڵێین؛ گەر لە دۆخێکدا قسەکردن و بێدەنگ بوون یەکسان بوون و هەمان ئەنجامیان هەبوو، هەڵبژاردنی بێدەنگی سوننەتە.

زمان توانستێکی وەها نییە بە ڕاست و چەپدا بەکاری بهێنێت. وەك چۆن پارەی گیرفانمان بەفیڕۆ نادەین و بە پلان و هاوسەنگانە خەرجی دەکەین، پێویستە ئاواش وشەکانمان دەستپێوەگرانە و بە جۆرێك جێی خۆی بگرێت بە شێوەیەکی گونجاو بەکار بهێنین. ئەو مرۆڤانەی خووی قسەکردنیان لە هەموو بابەتێکدا هەیە، بەفیڕۆدەری قسە و کاتن. وەك چۆن هەموو شتێك ئیسرافی هەیە، قسەکردنیش ئیسرافی هەیە خوای گەورەش ئەوەی بەیان کردووە کە بەفیڕۆدەرانی خۆش ناوێت. بە قسەکردنی زۆر ئیسرافی هەم گوفتار و هەم کات دەکرێت. لە کاتێکدا ئەم دوو نیعمەتە دوو بەهای زۆر گرنگن کە بە مرۆڤ سپێرراون. گەر مرۆڤ ئەم دووانە بە باشی بەکار بهێنێت، ئەوا بەختەوەریی هەردوو جیهان بەدەست دەهێنێت، ئەوانەی لە دونیادا ئەمانە بەهەدەر دەدەن، لە دوارۆژدا وەك بازرگانی مایە پوچ ناویان دەبرێت. لە ڕیوایەتێکی لاوازدا دەگێڕنەوە گەنجێك لە ئوحوددا سەرەڕای ئەوەی بەردی بە سکیەوە بەستبوو شەهید بوو، دایکی بەدەم سڕینی تۆزی ناوچاوانییەوە وتی "بەهەشتت موبارەك بێت کوڕەکەم!" پێغەمبەرمان کە گوێبیستی ئەمەبوو فەرمووی "لە کوێ زانیت؟ کێ ناڵێت ئەو قسەی بێ سود (مالا یعنی)ی نەکردووە.!" بەمەش

باسی ئەوەی بۆ کردووین کە ڕەنگە قسەی بێهوودە بەرەو لەناوچوون و خەسارەتمەندیمان ببات.[1]

لە لایەکی ترەوە بێگومان دەبێت لە شوێنی پێویستدا قسەی پێویست بکرێت. تەنانەت جاری وا هەیە قسە نەکردن دەبێتە گوناه. ئەو قسە و گفتوگۆ و وەعز و سیمینار و کارانەی لە پێناو نیشاندانی جوانییەکان و ناساندنی کارە باشەکان بە مرۆڤایەتی ئەنجام دەدرێت، خێرن و داخوازی پیشەی پێغەمبەرایەتین. لەناوبردنی خراپە و تێکشکاندنی یارییە تاریکەکان و قسەکردن لە پێناو ڕێگرتن لە خراپە، فەزیلەت و خێرێکی گەورەیە.

گەر هەق بە قسەکردن شوێنی خۆی بگرێت، قسەکردن لەوێدا ئەرکە، بێدەنگیش سەرپێچیکارییە. هێندەی زەرەرمەندیی ئەو قسانەی هەڵگری ڕەزامەندی خوایی و نیەتی گەیشتن بە ئامانجە ڕێپێدراوەکان نین، بێدەنگ بوونیش لەو کات و شوێنانەدا کە پێویستە قسە بکرێت، ناپەسەند و ناشرینە. گەر ئاکاری بێدەنگی هەردەم پەسەندکراویش بێت، قسەکردن لە هەندێك دۆخی تایبەتدا پەسەندتر و پێویستترە. باپیرانمان وتوویانە ''گەر قسەکردن زیو بێت، بێدەنگی ئاڵتونە''. ئەمە ڕاستیە، بەڵام لە هەندێك دۆخی جیاوازدا دەبێت جێی بێدەنگی بە گوفتار بدرێت، دەشبێت بزانرێت لەسەر چ پێوەرێك مەدالیای ئاڵتون چۆن دەبەخشرێت بە گوفتار. ڕەفتارێکی زۆر گرنگە بزانین لە کوێ دەدوێین و لە کوێش بێدەنگ دەبین. لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا، ئەوەی

---

١. أبو يعلى، المسند ٨٤/٧؛ الهيثمي، مجموع الزواهد ٣٠٣/١٠.

بێزمان ناوزەد بە شەیتانی بێزمان ناوزەد لە کاتی ژێرکەوتنی ڕاستیدا بێدەنگ دەبێت، بە شەیتانی بێزمان ناوزەد دەکرێت، ئەوانەش کە باس لە شتی بێسوود و بێهودە دەکەن وەک دۆست و تەرجومانی شەیتان وێنا دەکرێن.

یەکێک لە تایبەتمەندییە گرنگەکانی ئیمانداری کامڵ ئەوەیە بێدەنگییەکەی تێفکرین بێت و گوفتاریشی پڕ حیکمەت بێت. کاتێک ئەو بێدەنگ دەبێت، سەرقاڵی تێفکرینی "ئافاقی" و "ئەنفوسی" دەبێت. کە قسەش دەکات کانیی حیکمەت لە زاریەوە هەڵدەقوڵێت. ئەم سەرمایەیە بە هەرکەسێک بەخشرابێت، تووشی خێرێکی گەلێک مەزن هاتووە. بێگومان ئەمەش بە نسیبی هەموو کەس نایێت.

## برینی شمشێر سارێژ دەبێت، بەڵام سارێژبوونی برینی قسە ئەستەمە

باپیرانمان زۆر بە جوانی ئاماژەیان بەو کاریگەرییە نەرێنییە جێگیرە کردووە کە زمان لە دڵی دەکات و وتویانە "برینی شمشێر سارێژ دەبێت، بەڵام سارێژبوونی برینی قسە ئەستەمە" و "ئەوەی بە دەم دەیچنی بە دان بۆت هەڵناوەشێتەوە". هەندێک جار ئەو دڵەی بە وتەیەکی لە زار دەرچوو ئازار دەدرێت، تێپەڕینی چەندین ساڵیش چاکی ناکاتەوە. بۆیە برینی زمان لە برینەکانی دی ناچێت. برینە ماددییەکان پاش ماوەیەک دەڕۆن و چاک دەبنەوە، بەڵام ئەو برینەی زمان سەرچاوەکەیەتی، هەندێک جار بۆ تەمەنێک چاک نابنەوە.

زمان هەندێك جار نیعمەتە و هەندێك جاریش نیقمەت؛ هەندێك جار ڕەحمەت و هەندێك جاریش موسیبەت. هەندێك جار بە شیرینییەکەی مار لە کون دێنێتە دەر و هەندێك جاریش بە ژەهرەکەی چەندین برین دروست دەکات. لەبەر ئەمەیە لەسەر برینی زمان چەندین نووسین نووسراوە و چەندین گۆرانیش وتراوە. قسە تیرێکە و کاتێك لە کەوانەکەی دەردەچێت، گەڕانەوەی ئەستەمە. ڕووخاندن و وێرانکاری ئاسانە، چاککردنەوەش کارێکی گرانە. بۆ بەدەستهێنانی دۆستێك ساڵێك بەش ناکات، بەڵام لەدەستدانی دۆستێك کاژێرێکی بەسە. بۆیە پێویستە زمان لەڕێگەی بەدەستهێنانی دۆستی نوێ و بەردەوامیدان بە دۆستایەتییەکان بەکاربهێنرێت؛ پێویستە خۆمان لە تاوانی زویرکردنی هاوڕێ و هاوڕازان بپارێزین.

## ئیمانداری نموونەیی هەردەم ئاگای لە زمانیەتی

لە چوارچێوەی سوننەتدا موسوڵمانی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە موسوڵمانان لە زمان و دەستی پارێزراو دەبن.[1]

کاتێك لەنێو پێوانەکانی ئیسلامدا بۆ ئیمانداری نموونەیی دەڕوانین، یەکێك لە تایبەتمەندییە بەرچاوەکانی بریتییە لە پەرشکردنەوەی دڵنیایی و متمانە و ژیان لەنێو ئاسایش و ئارامیدا، بە جۆرێك نە بە گوفتار و نە بە کردار زیان بە هیچ کەسێك ناگەیەنێت. ئەو مرۆڤەی لەگەڵ

1. البخاري، الإيمان ٤، ٥، الرقاق ٢٦؛ مسلم، الإيمان؛ أبو داود، الجهاد ٢.

ئیماندارێکی لەم ئاستەدا دادەنیشێت، کاتێك بەجێی دەهێڵێت، چاوی لە دوا نابێت. دڵنیایە لەوەی ئەم ئیمانداره غەیبەتی ناکات و ناشهێڵێت غەیبەتی بکرێت. ئەو کەسەی زمان و دەستی لە چوارچێوەی ڕێپێدراودا بەکاردەهێنێت و دەستدرێژی ناکاتە سەر مافی خەڵکی، ئیمانداری کامڵە. هیچ زیانێکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لەم مرۆڤانە چاوەڕێ ناکرێت. ئەو ئیماندارەی گەیشتۆتە ئاستێکی وەها، هێندەی پارێزگاریکردن لە شکۆ و شەرەفی خۆی، پارێزگاری لە شکۆ و شەرەفی دۆستانیشی دەکات.

خاڵێکی تر کە لە فەرمووده پیرۆزەکەدا سەرنجمان ڕادەکێشێ ئەوەیە کە زمان لە پێش دەستدا ئاماژەی پێکراوە. لەم دەربڕینەوە تێدەگەین کە زیانگەیاندن لە ڕێگەی زمانەوە خیانەتکارانەتر و خراپترە لەو زیانەی لەڕێی دەستەوەیە. چونکە ڕەنگە بەرپەرچی ئەو هێرشە بدرێتەوە کە لەڕێی دەستەوە دەکرێت، بەڵام زۆرجار بەرپەرچی هێرشی زمان نادرێتەوە. هەم ئەو غەیبەت و بوختانانەی لە پاشەملە دەکرێن، زۆربەی کات بێ بەرامبەر دەمێننەوە. لە ئەنجامدا ئەم خیانەتە یەك لە دوای یەکانە، هەندێك جار تاکەکان و هەندێك جار کۆمەڵگەکان و هەندێك جاریش میللەتەکان دەبنە دوژمن و بە یەکدا دەدات. لەم سۆنگەیەوەیە کە دەوترێت درککردن بەو هێرشانەی لە ڕێگەی زمانەوە دەکرێن و دەستنیشانکردن و چاککردنەوەی ئەو وێرانکارییانەش کە بەڵای زمان دروستی دەکات، کارێکی ئێجگار قورسە.

لەبەر ئەمەشە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) لە وتە پیرۆزەکەیدا گرنگی بە زمان داوە و ئەوی پێش خستووە.

وشەی موسوڵمانمان لەلایەن خاوەنی ناوی "السلام" کە خوای گەورەیە، وەرگرتووە. دیسان خوای گەورەمان ناوی "إسلام" ی لە ئایینە پیرۆزەکەمان ناوە. ئەم وشانەش لە بنەڕەتدا دەچنەوە سەر وشەی "سلم" کە بە واتاکانی "ئاشتی و دڵنیایی و سەلامەتی" دێت. لە ژیانی ئیمانداردا دڵنیایی و ئاسایش و سەلامەتی خاڵی چەقیان داگیرکردووە و هەر دەبێت وەهاش بێت. کاتێکیش ئەو بە دڵێکی سەلیمەوە دەگەڕێتەوە لای خوا، سەرکەوتنێکی گەورە بەدەست دێنێت. لەبەر ئەوەی لە دەرگانەی خوادا نە ماڵ و سامان سوودیان دەبێت و نە ڕەچەڵەك و بنەماڵە، تەنها دڵێکی سەلیم و بێ خەوش دەتوانێت مرۆڤ ڕزگاری بکات. ئەو ژیانەی لە نێو سەلامەتیدا بەسەر دەبرێت، لە دواییدا ئیماندار بە دڵێکی سەلیمەوە دەباتەوە خزمەت خوای خاوەن سەلامەتی و بەم هۆیەوە ئینشائەڵڵا سەرەنجامی خێر دەبێت...

یەکێك لە مەرجە بنچینەییەکانی ژیانی نێو سەلامەتی و ئاسایش بریتییە لەوەی کەسێك زیانی گوفتاری یاخود کرداری لە کەسێکی دی نەدات. ئەوانەی لەم دوو بابەتەدا سەرکەوتوو دەبن، پاداشتەکەی لە دوارۆژدا بە زیادەوە وەردەگرن.

لە پێناو قووڵ بوونەوە لەنێو ئیمان و بەرزکردنەوەی ئاستی چۆنیەتی باوەڕەکەیاندا، پێویستە ئیمانداران لە ئیمانی نەریتی و "إجمالي"یەوە وەربچەرخێن بۆ ئیمانی "تحقيقي" و "تفصيلي" و لە ئەنجامدا ژیانیان بە جۆرێك دەبێتە ئاوێنەی خوای گەورە، کە دەدرەوشێتەوە. بۆ گەیشتن بەم لوتکەیە، دەبێت زمانمان لەو نەخۆشیانە بەدوور بگرین کە بە ئافاتی زمان دەناسرێن و هەردەم لە سەر هێڵی ڕەزامەندی خوا بەکاری بهێنین.

## هۆکاری وەرچەرخانێکی گرنگ: قسەکردنی کورت و پوخت

ئەوەی خوازیارە مەودای مەعنەوی ببڕێت و ئارەزووی نزیکی خوای گەورە دەکات، پێویستە گرنگی بەم سێ بابەتە بدات: کەمخۆری، کەم خەوی و کەم بێژی. لەبەر ئەوەی ئەم بابەتەی ئێستامان جەخت لەسەر کەم گوتن دەکاتەوە، ئێمە لێرەدا چاوپۆشی لە کەمخۆری و کەم خەوی دەکەین و تەنها لەسەر کەم گوتن دەوەستین.

کەم گوتن؛ ئەو گوفتارە کەم و پوخت و بە حیکمەتەیە کە هەردەم لەسەر ڕاستەڕێیە و بەرییە لە خراپییەکانی زمان، وەك غەیبەت و بوختان و بەخیلی و باسکردنی پاشەملە. ئەوانەی کەم ناڵێن و ئاگایان لە قسەکانیان نییە، ناتوانن ببنە قوتابی قوتابخانەی عیرفان. یەك لەو تایبەتمەندیانەی کە بۆ بوونە قوتابی ئەم قوتابخانەیە پێویستن، قسەکردنی کەم و پوخت و بەحیکمەتە. بە دەربڕینێکی تر، ئەو کەسەی دەیەوێت لە ڕێی مەعریفەتدا مەوداکان ببڕێت، لە پێشدا دەبێت ئاگای لە گوفتاری بێت. پێویستە کەسێکی ئاوا ئەو بابەتەی باسی دەکات یان چواردەورەکەی باسی دەکەن ببەستێتەوە بە باسی خوای مەزن و پێغەمبەری ئازیزمانەوە؛ تەنانەت دەبێت بە جۆرێك لە جۆرەکان گفتوگۆ بەتاڵەکانیش بکاتە گفتوگۆی خواناسی. دەبێت هەمیشە وتەی هەق لە زاری بێتە دەر و زمانیشی هەردەم تەرجومانی ڕاستی بێت.[1]

ئەو ڕێگایانەی دەمان گەیەننە خوای گەورە، هێندەی ژمارەی هەناسەی بوونەوەرەکان زۆرن، بەڵام هەندێك بابەتیش هەن کە لە کاتێکی

[1]. م.فەتحوڵلا گولەن، ئیکسیری ئەمری.

کەمدا مەودایەکی دوور بە مرۆڤ دەبڕن. گوفتاری کورت و پوختیش ئەو ڕەوشتە بەرزەیە کە لە ماوەیەکی کەمدا پلەیەکی بەرز دەبەخشێتە مرۆڤ و دەبێتە مایەی خۆشەویستی و سەرنجی خوای گەورە بۆی. ئەم ڕەفتارە، ڕەوشتی پێغەمبەر و هاوەڵانیەتی. دڵانی تامەزرۆی جوانی خوا کۆشش دەکەن تا لە کۆت و بەند و بەربەستی زۆر نوستن و زۆر خواردن و زۆر وتن ڕزگاریان بێت، دەبێت بێدەنگی بکەنە ڕەوشتێکی بەردەوامی خۆیان. دەبێت هەردەم ڕاستی بهێننە سەر زار، پێویستە خۆیان لە خراپییەکانی زمان بپارێزن و بەتایبەتیش خۆیان بە دوور بگرن لە دەردی غەیبەت.

# غەیبەت چییە؟



"خەریکی یادی خوا بن! چونکە ئەوە شیفایە.
هەرگیز باسی پاشملەی مرۆڤەکان مەکەن؛
چونکە ئەوە خودی دەردە."[1]
حەزرەتی عومەر (رضي الله عنه)

غەیبەت واتا کوردییەکەی (باسکردنی خراپەی پاشەملە)یە، وتنی شتانێکی نەخوازراوە دەربارەی کەسێك لە کاتی نەبوونی خۆیدا، ئەو تاوانەیە کە لە لایەن زۆرێك لە زانایانی ئیسلامەوە وەك گوناهێکی گەورە ناسێنراوە. غەیبەت بریتییە لە باسکردنی پاشەملە و تانەدان لە کەسی بەرامبەر، چ لە جلوبەرگ و هەڵکەوتەی جەستەیی و ڕەفتار و کەسوکاری مرۆڤێك تا دەگاتە ئەو خانووەی لێی نیشتەجێیە و ئەو

---

١. ابن أبي الدنيا، الصمت وآداب اللسان ١/١٣٣، ٢٨٨.

هۆکاری گواستنەوەیەی بەکاری دەهێنێت و سەرجەم ئەو بابەتانەی پەیوەندییان بە کاروباری دونیاوە هەیە. غەیبەت هێرشێکە بۆ سەر شکۆ و شەرەفی ئیماندار و بە جۆرێك لە جۆرەکانیش نارەزایی نواندنە بەرامبەر تەقدیری خوای گەورە. سەرەڕای هەموو ئەمانە، بەفیڕۆدان و ئیسرافی سەرمایەی بەنرخی کاتە. کاتێك پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) لە هاوەڵانی پرسی "دەزانن غەیبەت چییە؟"، لە وەڵامدا فەرموویان "بێگومان خوا و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن". پێغەمبەرمان بەم جۆرە بۆی ڕوون کردنەوە "غەیبەت؛ باسکردنی براکەتە بە جۆرێك خۆی پێی خۆش نەبێت"، هاوەڵان فەرموویان "ئەی ئەگەر ئەو شتەی دەیڵێین لە براکەماندا هەبێت؟" پێغەمبەری ئازیز وەڵامی ئەم پرسیارەشی بەم جۆرە دایەوە "ئەگەر ئەو شتەی دەیڵێیت لەودا هەبێت ئەوا غەیبەتت کردووە. گەر ئەو شتەی وتوتە لەودا نەبێت، ئەوا بوختانت بۆ هەڵبەستووە!!"[١]

بە گوێرەی ڕەوشتی ئیسلام وەك چۆن شکاندن یان گاڵتەپێکردنی ڕووبەڕووی کەسێك نەخوازراوە، باسکردنی پاشەملەشی قەدەغە کراوە. ناو و ناتۆرەنان لە خەڵکی و شکاندنیان و بەدواداچوونی دۆخە شاراوەکانیان، لەو ڕەفتارە خراپانەن کە ئیسلام هەرگیز ڕێگەیان پێنادات. خوای گەورە لە سورەتی "الحجرات"دا ئاماژە بە ناشرینی ئەم ڕەفتارانە دەکات و بەم جۆرە باس لە غەیبەت دەکات:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱجْتَنِبُوا۟ كَثِيرًا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ ٱلظَّنِّ إِثْمٌ ۖ وَلَا تَجَسَّسُوا۟ وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا ۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ ﴾ (الحجرات: ١٢)

---

١. مسلم، البر ٧٠.

"کەستان غەیبەتی کەستان مەکەن، کەس لە ئێوە حەز دەکات گۆشتی براکەی بە مردوویی بخوات؟ خۆتان لەمە بەدوور بگرن! لە سزای خوا بترسن و خۆتان لەم کارە ناشرینە بپارێزن، خوای گەورە تەوبە قەبووڵ دەکات و خاوەن میهرەبانییە"

وەك هۆکاری دابەزینی ئایەتە پیرۆزەکە، ئەم ڕووداوە دەگێڕنەوە: کاتێك پێغەمبەری ئازیزمان (عَلَيهِ أَفْضَلُ صَلاةٍ وَسَلام) دەچوو بۆ سەفەر، هاوەڵێکی هەژاری دەنارده لای دوو کەس کە باری دارایيان باش بوو بۆ ئەوەی کاریان بۆ بکات. هەر بەم جۆرە سەلمانی فارسیشی نارده لای دوو کەسایەتی لە نێو هاوەڵاندا. خزمەتی ئەوانی دەکرد و خواردنی بۆ ئامادە دەکردن. ڕۆژێکیان لەبەر ئەوەی بەخەبەر نەهاتبوو، هیچی ئامادە نەکردبوو. دوو هاوەڵەکە حەزرەتی سەلمانیان نارده لای پێغەمبەرمان تا داوای بەرچایی لێ بکات. پێغەمبەریشمان ئەوی نارده لای حەزرەتی ئوسامە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ). کاتێك سەلمان (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) ڕۆیشت و داوای بەرچایی لە ئوسامە کرد، ئوسامەش نەیبوو، بۆیە بە دەستی خاڵی گەڕایەوە و دۆخەکەی بۆ ئەو دوو زاتە باس کرد، ئەوانیش وتیان "ئوسامە هەیبووە بەڵام ڕەزیلی کردووە". دواتر حەزرەتی سەلمانیان نارده لای کەسانی دی بۆ دەستخستنی شتێك بۆ خواردن، بەڵام سەرەڕای هەموو هەوڵەکانی، دیسان سەلمان بە دەستی خاڵی گەڕایەوە. لەسەر ئەمە ئەو دوو زاتە بەم جۆرە لۆمەی سەلمانیان کرد "گەر سەلمان بنێرینە سەر بیری "سومەیها" تەنانەت ئاوەکەی ئەویش وشك دەکات". پاش ماوەیەك ئەم دوو هاوەڵە ڕۆشتنە خزمەت پێغەمبەری خوا. خۆری هەردوو جیهان پێی فەرموون "بۆچی من چەوری گۆشت لەسەر دەمی

ئێوە دەبینم؟""، ئەوانیش لە وەڵامدا وتیان "سوێند بە خوا ئەمڕۆ ئێمە نە گۆشتمان خواردووە نە هیچ شتێکی دی!" پێغەمبەری ئازیز فەرمووی "ئێوە (هەرچەندە هەستیشی پێ نەکەن)، بەڵام گۆشتی سەلمان و ئوسامەتان خوارد"[1].

غەیبەت، وەك لە ئایەتە پیرۆزەکەدا ئاماژەی پێدراوە هێندەی خواردنی گۆشتی مرۆڤێکی مردوو گوناهێکی بەد و قێزەونە. مرۆڤێکی مردوو چەندە بێ دەسەڵاتە لەمەڕ بەرگریکردن لەخۆی، ئەو کەسەش کە غەیبەتی دەکرێت بێ خەبەرە لەو غەیبەت کردنە و بێ بەرگری و بێ چارەیە. واتە ئەوەی غەیبەت دەکات کردەوەیەکی ناشرین و بێزراوی وەك پەلاماردانی مردوویەکی ئەنجامداوە. هیچ ئیماندارێکی کامڵیش بۆ ئاستێکی وا دانابەزێت. قەپاڵدان لە جەنازەیەك چەندە نەشیاوە، غەیبەتیش کردەوەیەکی هێندە نەشیاو و نالەبارە. هەم تاوانێکی تا دوا ڕادە قێزەونە و هەم دەردێکی کوشندەیە کە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی موسوڵمانان لاواز دەکات. وەك چۆن قاچی جەستەیەك ئیرەیی بە دەستی نابات و نایەوێت زیانی پێ بگات، بە هەمان شێوە ئیماندارانیش غەیبەتی یەکدی ناکەن و ناشبێت بیکەن. بە پێچەوانەوە هەم پەیوەندی بەهێزی نێوان براکان لاواز دەبێت و هەم هەڵسوکەوتی پێچەوانەی ئیخلاس ئەنجام دەدرێت.

پێغەمبەری ئازیزمان (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لەو ئامۆژگارییانەدا کە پێشکەشی سولەیمی کوڕی جابیری کرد، ئەم خاڵە گرنگانەمان یاد دەخاتەوە "هیچ چاکەیەك بە بچوك مەزانە، تەنانەت خاڵی کردنەوەی

---

١. الزمخشري، الكشاف ٣٧٧/٤؛ أبو سعود، التفسير ١٢٢/٨.

جامی ئاوەکەت بۆناو جامی ئاوی کەسێکی دیکەش! بە ڕوخساری شیرینەوە پێشوازی لە برا ئاینیەکەت بکە و زەردەخەنەی بە ڕوودا بکە! کاتێکیش لێت جودا دەبێتەوە و دەڕوات، لە پاشەملە بە خراپە باسی مەکە!"[1]

ئیماندار، ناوەوە و دەرەوەی وەك یەکە. ئەو، نایەت بە رووتدا پێبکەنێت و لە پشتەوە باست بکات. چونکە ئەو لە هەموو دۆخێکدا خاوەندارێتی لە مافی براکەی دەکات، شکۆ و شەرەفی ئەو بە شکۆ و شەرەفی خۆی دەزانێت. ئەحنەفی کوڕی قەیس لەم بارەیەوە دەڵێت "بیرم نایەت هیچ کەسێك لە لام هەستابێت و ڕۆیشتبێت، من لە پشتەوە بە خراپە باسم کردبێت"[2] بەم جۆرەش دەبێتە نموونەی باڵا بۆ موسوڵمانان.

پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) چەند هۆشدارییەکی دی دەداتە ئیمانداران و دەفەرموێت "هەرگیز ئیرەیی بە یەکدی مەبەن! تەنها بۆ کۆکردنەوەی موشتەری مامەڵەیەك مەکەن کە نایکرن تا ببنە هۆی بەرزکردنەوەی نرخەکەی، قین و نەفرەت بەرامبەر یەکدی بنیات مەنێن! لە یەکدی زویر مەبن و پشت لە یەکدی هەڵ مەکەن! با ئەو کرین و فرۆشتنەی مامەڵەکەی کۆتایی هاتووە، کەسێکی دی نەیەت مامەڵەی تێدا بکات و هەڵی بوەشێنێتەوە! ئەی بەندەکانی خوا، برا بن! موسوڵمان برای موسوڵمانە؛ زوڵمی لێ ناکات، بچوکی ناکاتەوە و بە کەم تەماشای ناکات و (لە کاتی پێویستیدا) جێی ناهێڵێت"[3].

١. علي المتقي، كنوز العمال ١٨٨/٦.

٢. إبن أبي الدنيا، الصمت و أداب اللسان ١٣٢/١.

٣. مسلم، البر ٣٢.

لە پاش ئەم یادخستنەوانە ئەو، سێ جار ئاماژەی بۆ سەر سنگی کرد و فەرمووی "تەقوا لێرەدایە. بە کەم ڕووانینی موسوڵمان بۆ براکەی، بەسە بۆی وەك خراپە! خوێن و سامان و داوێن و ناموسی موسوڵمانێك حەرامە بە موسوڵمانێکی دی".

موسوڵمانان بران و زوڵم لە یەکدی ناکەن. نە ڕووبەڕوو و نە لە پاشەملە یەکدی بە کەم نابینن، گاڵتە بە یەکدی ناکەن و یاری بە شکۆی یەکتر ناکەن. گەر ئەمانە بکەن، ئەو خراپەیەی ئەنجامیان داوە وەك گوناھ بەسە بۆیان و زیادیشە! نابێت لە یادمان بچێت، ئەم تاوانانە کۆمەڵێك ھەڵەی وا نین بەرێ بکرێن و بە کەم تەماشابکرێن. ئێمە ھەست دەکەین ھەندێك شت ساکار و بێ گرنگین، لە کاتێکدا ڕەنگە لەلای خوای گەورە بە گوناھێکی گەورە بنووسرێن.

بە گوێرەی بەدیعوززەمان خوای گەورە لە سورەتی "الحجرات"دا بە ئامرازی پرسیاری سەرەتای ئایەتەکە لە شەش ڕوانگەی جیاوازەوە پرسیار لە ئیمانداران دەکات:

١. ئایا ئەقڵتان نییە، وا لە شتێکی ھێندە ناشرین تێناگەن؟ ئایا توانستی بیرکردنەوە و درککردنتان لەدەست داوە وا ڕێژەی قێزەونی کردەوەیەکی وا ھەست پێ ناکەن؟

٢. چی بەسەر دڵتاندا ھاتووە وا خۆشەویستیتان چووەتە سەر گوناھێکی وەھا؟ چۆن شتێکی ھێندە قێزەونتان خۆش دەوێت؟

٣. چۆن ژیان و ژیارتان کە لە لە ژیانی بە کۆمەڵ و ھەستکردنی

دەستی شەیتان. بۆیە نابێت بچینە نێو ئەو گۆڕەپانانەوە کە ڕەنگە پێمان لە مینی غەیبەت هەڵبکەوێت. گەر چووشین دەبێت باش بزانین چۆن هەڵسوکەوت دەکەین. پاش ئەوەی دڵنیا دەبین لەوەی دڵمان بە تەواویی بە گوێرەی بیرۆکە پاراوەکان هەڵسوکەوت دەکات، بەکارهێنانی کۆمەڵێك دەستەواژە بە نیەتی باش و بیرۆکەی پاراوەوە بە مەبەستی چارەسەرکردنی ناتەواویی کەسێك نابێتە غەیبەت. بەڵام وەك ئاماژەمان بۆ کرد، ئەم زەمینە گەلێ خلیسك و فریودەرە. گەر هاوسەنگیی دڵ بە باشی ڕانەگیرێت، هەموو کات ئەگەر هەیە شەیتان جڵەو بگرێتە دەست و ئاراستەی ئەو ڕێگەیەی بە نیەتی باش دەستی پێ کراوە، بەرەو دۆزەخ بگۆڕێت.

بە گوێرەی ئەم پێوەرە هەستیارە، گەر باسکردنی بیروبۆچوونی کەسێك تەنها بە مەبەستی تانەدان و بەکەم زانینی ئەو بێت، ئەوا دەبێتە غەیبەت و گەر باسکردنی هەمان بیروبۆچوونیش لە پێناو ڕاستکردنەوەیدا بێت، یاخود باسکردنەکە بە هەر نییەتێکی تری باش بێت، نابێتە غەیبەت. تەنانەت زۆرجار گەڕاندنەوەی مرۆڤەکان لە ڕێگەی خراپ و ڕاستکردنەوەی بیروبۆچوونیان دەبێتە مایەی پاداشتیش. لێرەدا دەبێت سەرنجی خاڵێکی زۆر گرنگ بدەین؛ گەر توانیمان بەبێ ناوهێنان بگەینە ئەنجام، ئەوا نابێت ناو بهێنین و پێویستە بە گشتگیری لە بابەتەکە بدوێین.

لێرەدا ڕاستیی ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە قسەکردن بە هەستی ڕق و کینەوە لە پشت ئەو کەسانەی کەیفمان پێیان نایە و خۆشمان

مەبەستی ئازاردانی، جوولەکەیەك بە "...جوولەکە" و مەسیحییەك بە "...مەسیحی" بانگ بکات، ئەوا گوناهی دەکات.[1] بۆیە پێویستە ئیمانداران پاراویی ڕەفتاریان لەئانەت لە بەرامبەر ئەو کەسانەدا بپارێزن کە دارای ئیمان نین.

وەك چۆن کوشتنی مرۆڤێك بە ناهەق یان دەستدرێژی کردنە سەر ماڵ و سامانەکەی گوناهە، هەرواش شکاندنی شکۆی ئەو کەسە و قسەکردن لەبارەی ئەو شتانەوە کە شەرەف و ناموسی لەکەدار دەکەن تاوانێکی بەرچاوە. ئەو تەقواداره ڕاستەقینەیەی کە بە هەستی لێپرسینەوەی خوای گەورەوە دەژی، وەك چۆن لە دڵەوە بڕوای بەو خوایە هەیە کە غەیبە و دیار نی یە، ئاواش لە پاشملە غەیبەتی کەسێکی تر ناکات.

بۆ ئەوەی باسکردنی پاشەملەی کەسێك بە غەیبەت هەژمار بکرێت، دەبێت ئەو کەسە بناسرێت. باسکردنی کەسێك کە ئامادەبووەکان نایناسن غەیبەت نییە، بەڵام هەر باس نەکرێت باشە. کاتێك پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وصَحۡبِهِ وَسَلَّمۡ) ڕەفتاری خراپی کەسێکی دەدی، بێ ئەوەی ناو بهێنێت دەستەواژەی گشتگیری بەکاردەهێنا و دەیفەرموو "هەندێ کەس چییان بەسەر هاتووە وا بەو جۆرە دەکەن؟"

یەکێك لەو تایبەتمەندییانەی لە بابەتی غەیبەتدا پێویستە لەسەری بوەستینەوە، نییەتە لە باسکردنی کەسانی دیکەدا. ئەمەش خاڵێکی زۆر ناسکە و زەمینێکی خلیسکیشە. ڕەنگە ئەو کەسانەی دڵیان بە باشی ڕوونەکردووەتە خوا، لەم خاڵەدا بە هەڵەدا بچن و ببنە یاری

1. ابن حبان، صحيح ١١/٢٣٨.

لێیان نایەت، غەیبەتە. ئەو ئەرکەی دەکەوێتە سەر ئیماندار باسکردن و غەیبەتکردنی ئەو کەسە ئامادەنەبووانە نییە کە بە جۆرێك لە جۆرەکان لە خۆیان یان لە کارێکیان ناڕەحەتە، بەڵکو بریتییە لە جڵەوکردنی تووڕەییەکەی و سووڕاندنی ئاوێنەکە بەرەو ڕووی خۆی. چونکە گەورەکانمان هانمان دەدەن تا لە بری باسکردنی کەسانی دی، ناتەواوییەکانی خۆمان بخەینە بەر چاو. ئەوان ئەم ئامۆژگارییەمان دەکەن "هەرگیز خۆت وەك ژمێریاری گوناهی کەسانی دی مەبینە و خۆت بە هەڵەی ئەم و ئەوەوە سەرقاڵ مەکە! گەر سەرقاڵبوونت بە هەڵەکانەوە چێژت پێ دەدات، ئەوا ئەم خولیایەت بەرامبەر گوناهەکانی خۆت بەکار بهێنە تا پەڵە بچووکەکانی خەڵکی، پەڵە تۆخەکانی خۆتت لەیاد نەبەنەوە"[1]

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رضيَ اللهُ عَنْهُ) پێمان ڕادەگەیەنێت کە پێویستە ئیماندار لە پێشدا سەرقاڵی هەڵەکانی خۆی بێت و دەفەرموێت "کاتێك هەڵەی هاوڕێکانت دێت بە خەیاڵدا، یەکسەر هەڵەکانی خۆت بهێنەرە بەر چاو"[2]

بەکری کوڕی عەبدوڵڵای ئەلموزەنی دەڵێت "ئەو مرۆڤەی هەڵەی خۆی لەبیر دەکات و سەرقاڵی هەڵەی کەسانی دی دەبێت،ئەوە گیرۆدەی مەکری ئیلاهی بووە"[3]

---

١. م.فەتحوڵڵا گولەن، ئەو ئاسۆیەی ڕووناکی لێوە دیارە.

٢. إبن أبي الدنيا، الصمت و آداب اللسان ١/١٣٠.

٣. إبن جوزي، صفة الصفوة ٣/٢٤٩.

ڕەنگە خوای گەورە بۆ ماوەیەك مۆڵەت بداتە ئەم کەسە، بەڵام هەرگیز پشتگوێی ناخات و بێگومان ڕۆژێك بە جۆرێك لە جۆرەکان باجی ئەم کردەوەیەی پێ دەداتەوە.

یەکێك لە لاوازییەکانی نەفسیش ئەوەیە کە شتە نەرێنییەکان ناهێنێتە سەر خۆی و یەکسەریش خۆی دەکاتە خاوەنی شتە نەرێنییەکان. ئەو، کاتێك بەخششی پێدەدرێت، بە ڕاکردن دێتە پێشەوە بەڵام کاتێك بانگهێشتی خزمەت دەکرێت؛ باس لە هەڵەکان و لە مردن دەکرێت، دەکشێتەوە. چەند جوانە ئەو وتەیەی کە دەڵێت "ئێمە بۆ ناتەواوییەکانی خەڵکی وەك هەڵۆ واین و بۆ هەڵە و ناتەواوییەکانی خۆشمان وەك مشکەکوێرەین". حەزرەتی حەسەن بەسریش بەم ڕستەیە گوزارشت لە چاوپۆشینی مرۆڤ دەکات لە هەڵەی خۆی "ئەی نەوەی ئادەم! ئایا تۆ پارچە زیخێکی نێو چاوی براکەت دەبینیت و ڕەگێکی گەورەی نێو چاوی خۆت هەست پێناکەیت؟"[1] هەر ئەو لەم بارەیەوە بەم جۆرە ڕێنوێنیمان دەکات "ئەی نەوەی ئادەم! هەتا واز لە تانەدان لە مرۆڤەکان نەهێنیت لەسەر هەڵەیەك کە لە خۆشتدا هەیە و بۆ چاککردنیش لە خودی خۆتەوە دەستپێنەکەیت، ناگەیت بە (ڕاستی ئیمان). جا گەر بۆ بابەتی چاکسازی لە خۆتەوە دەستپێبکەیت، ئەوا یەکەم سەرقاڵی تۆ نەفسی خۆت دەبێت. خۆشەویستترین بەندەی خواش ئەو کەسەیە کە سەرقاڵی ناتەواوییەکانی نەفسی خۆیەتی"[2].

---

١. عبدالله إبن مبارك، الزهد ٦٩/١-٧٠.

٢. إبن جوزي، صفة الصفوة ٢٣٤/٣.

دیارە تەمێکردنی نەفسیش کاری هەموو کەس نییە بەڵکو کاری کەسی مەردە. سەرقاڵبوون بە هەڵەکانی خۆد لە بری ناتەواوی و هەڵەی کەسانی تر، تایبەتمەندیی ئەو مەردی مەیدانانەیە کە توانیویانە لە تەمێکردنی نەفسیاندا سەرکەوتوو بن، ئەوانەی توانیویانە لە قەرەی ئەم تاقیکردنەوە سەختە بێن، مانای وایە هەورازێکی تا بڵێی سەختیان تێپەڕاندووە.

خوای گەورە بمانکاتە یەکێك لەوانەی لەبەر پینەکردنی ناتەواوییەکانی خۆیان نایانپەرژێتە سەر نارێکی و دڕاوییەکانی خەڵکانی دی! چۆن ئەگەر هەر کەسێك بەردەم ماڵەکەی خۆی خاوێن بکاتەوە، گەڕەکەکە و شارەکە پاك و خاوێن دەبێت، لە ئەنجامی سەرقاڵبوونی خەڵکیش ڕاستەوخۆ بە هەڵەکانی خۆیانەوە، کۆمەڵگە خاوەن فەزیلەتەکەی نێو خەیاڵی فارابی دەبێتە ڕاستی.

# جۆرەکانی غەیبەت



"هەندێ کەس ڕیشاڵەکانی نێو دەمیان پچڕاوە. وەک کیسەی دڕاو چی تێدابێت دەیڕژن. شتانی وەک غەیبەت بە کەم مەزانە. ئەو داماوانە نازانن کە بەمە خۆیان بۆ مایەپووچی ئامادە دەکەن."

موحەممەد فەتحوڵڵا گولەن

## جۆرەکانی غەیبەت بە شێوەیەکی گشتی

وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا، ئەو شتانەی دەچنە نێو گۆڕەپانی غەیبەتەوە دەکرێت پەیوەندییان هەم بە دینەوە هەبێت، هەم بە دونیاوە. زانای گەورەی ئیسلام ئیمامی غەزالی، لە کتێبی "إحیاء علوم الدین"دا لە شەش جۆری جیاوازدا باس لە غەیبەت دەکات و بەم شێوەیە لەسەریان دەوەستێت:[1]

---

١. غزالي، إحياء علوم الدين ٣/١٤٣-١٤٤.

## غەیبەت دەربارەی جەستە

بەکارهێنانی دەستەواژەکانی وەك "فڵانە کەس خێلە، کوێرە، کەچەڵە، دەموچاو زیپکاوییە، باڵا کورت یان درێژە...هتد" بۆ باسکردنی ناتەواویی جەستەیی کەسێك. تانەدان لە خەڵکی بە بەکارێنانی ئەم جۆرە دەستەواژانە بەرەکەتی ژیان دەبات و دەبێتە هۆکاری سەرشۆڕی و ڕیسوایی ئەو دونیا.

ڕۆژێك حەزرەتی عائیشە باسی کورتەباڵایی صەفیەی دایکمانی کرد، لە بەرامبەردا پێغەمبەری خوا ئاگاداری کردەوە و پێی فەرموو "قسەیەکی وات کرد گەر بێت و ئەو قسەیە بخەیتە دەریاوە ئاوەکەی بۆگەن دەکات"[١]

جارێکیشیان ئیبن سیرینی زانای ئیسلام لە باسکردنی کەسێکدا دەستەواژەی "ئەو پیاوە ڕەشە"ی بەکارهێنا. لە پاش بەکارهێنانی ئەم دەربڕینە ڕاستەوخۆ داوای لێخۆشبوونی کرد و وتی "من بەو دەربڕینەم کەوتمە غەیبەتەوە".

١. أبو داود، الأدب ٣٥، القيامة ٥١؛ أحمد بن حنبل، المسند ١٨٩/٦.

## غەیبەت کردن لەو بابەتانەدا کە پەیوەندیدارن بە ڕەوشت و کەسایەتییەوە

بەکارهێنانی دەستەواژەکانی وەك "خووی خراپە، خۆ پەرستە، نەوزەیە، خۆبەزلزانە، ڕیاکارە، ترسنۆکە، بێ دەسەڵاتە.." دەربارەی هەر کەسێك، دەچێتە ڕیزی ئەم جۆرەی غەیبەتەوە، بۆیە پێویستە غەیبەتی ئەم لایەنانەی مرۆڤ نەکرێت.

بەپێی گێڕانەوەیەکی موعازی کوڕی جەبەل (رضي الله عنه)، ڕۆژێکیان لە خزمەت پێغەمبەری ئازیزدا (صلى الله عليه وسلم) وەك بێ دەسەڵات و لاواز باسی کەسێك کرا. پێغەمبەری خوا یەکسەر فەرمووی "غەیبەتی براکەتان کرد!"

کاتێك هاوەڵان فەرموویان ئەو وەك ئەوەیە کە ئێمە دەڵێین، پێغەمبەری خوا فەرمووی "گەر وا نەبێت، بوختانتان بۆ کردووە."[١]

### غەیبەت کردن لە بابەتە ئاینییەکاندا

بەکارهێنانی ڕستەکانی وەك "فلان کەس بەڕۆژوو نابێت، نوێژ بە جوانی ناکات، تەمبەڵی لە زەکات داندا دەکات..." ئەو جۆرەی غەیبەتە کە دەربارەی بابەتە ئاینییەکان دەکرێت.

---

١. الطبراني، معجم الکبیر ٢٠/٣٩.

## غەیبەت لە بابەتە دونیاییەکاندا

ئیمامی غەزالی، دەستەواژەکانی وەك "فڵان کەس بێ ئەدەبە، ڕەچاوی مافی خەڵك ناکات، زۆر قسە دەکات، زۆر دەخەوێت، زۆر دەخوات.." بە غەیبەتی دونیایی ناوزەند دەکات.

## غەیبەت لە بارەی جل و بەرگەوە

بەکارهێنانی دەربڕینەکانی وەك "جلی فڵان کەس فراوانە، تەسکە، درێژە، کورتە، ناشرینە، پیسە.." دەربارەی جلوبەرگی کەسانی دی، دەچێتە خانەی ئەم جۆرە غەیبەتەوە.

حەزرەتی عائیشەی دایکمان (رَضِيَ اللهُ عَنْها) ئەم ڕووداوەمان بۆ دەگێڕێتەوە ''هەرگیز غەیبەتی کەس مەکەن! من جارێکیان لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بە ژنێکم وت ''چەندە ژنێکی کراس درێژە''، لە وەڵامی ئەمەدا پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) پێی فەرمووم ''تف بکە''. منیش پارچە گۆشتێکم تفکردەوە''[١]

---

١. إبن أبي الدنيا، الصمت و آداب اللسان ١٣٨/١.

## ئەو غەیبەتانەی کە لە شکڵ و شێوەی جیا جیادا دەکرێن

لە پاڵ ئەو پۆلێنە گشتییەی غەزالیدا کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێدا، لەمرۆماندا چەند جۆرێکی تری غەیبەت لە شکڵ و شێوەی جیا جیادا خۆیان دەردەخەن. دەکرێت لەژێر ئەم ناونیشانانەی خوارەوەدا باسیان بکەین:

### خۆ من غەیبەت ناکەم!

هەندێك لە مرۆڤەکان لە کاتێکدا غەیبەتیش دەکەن، کەچی بانگەشەی ئەوە دەکەن کە غەیبەت نییە و دەڵێن "من غەیبەت ناکەم، ئەوە دەڵێم کە لەودا هەیە!"، بەم جۆرە هەوڵ دەدەن خۆیان خاوێن نیشانبدەن. ئەو مرۆڤانە گەر بە ئەنقەست و بە ئیرادەی خۆیان ئەمە بڵێن، ئەوا هەڵەیەکی گەورە دەکەن. چونکە قسەکردنێکی لەم جۆرە، بە ڕاددەیەك مەترسیدارە کە مرۆڤ لە کەندەڵانی بە حەڵاڵ هەژمارکردنی شتێکی حەرامکراوەوە فڕێ دەداتە خوارەوە، ڕەنگە قسەکردنێکی لەم جۆرە کار لە ئیمان بکات. بۆیە پێویستە بە هەموو جۆرێك خۆمان لەم جۆرە قسانە بەدووربگرین.

## من ئەمە بە خودی خۆشی دەڵێم

بەیەکێک لەو هەڵانەی کە تێی دەکەوین لە بابەتی غەیبەتدا بریتییە لەوەی کە دەڵێین "من ئەمە بە خودی خۆشی دەڵێم". هەوڵدان بۆ داڕشتنی غەیبەت لەو فیزەونیەی کە هەیاتی بەم شێوەیە نەک نابێتە مایەی بلاو پێکردن بەڵکو زۆر پێکەنیناویشە. پێناسەی غەیبەت بریتییە لە "وتنی شتێک لە پاشەملەی کەسێکدا کەگەر بەرەوڕوو پێی بلێیت پێی خۆش نابێت"، بۆیە وتنی ڕووبەڕووی ئەو شتەی بابەتی غەیبەتەکە وتنی پاشەملەی شتەکە حەلاڵ ناکات. بەپێی پێناسەکە بۆمان دەردەکەوێت کە پێوەری غەیبەت بریتییە لە ناڕەحەت بوونی کەسەکە لە کاتی وتنی ئەو قسەیە بەرەوڕووی خۆی. ئەو قسەیەی کە لە بەرەوڕوودا ناڕەحەتی دروست دەکات، گەر لە پاشەملە بکرێت، ناڕەحەتی زیاتریش بەرهەم دەهێنێت و قسەیەکی لەم جۆرەش دواجار لە غەیبەت زیاتر هیچی دی نییە. بۆیە وتنی "ئەمە بە خودی خۆیشی دەڵێم"، لە پێناو پاك نیشاندانی ئەو غەیبەتەی کە دەکرێت، هیچ واتایەکی نییە. ئەم کاردانەوە بەرگریکارانەش لە هەڵخەڵەتاندنەکانی شەیتان زیاتر هیچی دی نین.

## ئاماژەکانی چاو و برۆ

شکاندنی مرۆڤێك بە ئاماژەی دەست و بەکەم زانینی بە ئاماژەی چاو و برۆ، جۆرێکە لە غەیبەت. هەموو ئەو جۆرە قسە و کردارانەی کە

مەبەستی گاڵتەپێکردن لەخۆ دەگرن و هەستی بەرامبەر بریندار دەکەن، لە چوارچێوەی غەیبەت دایە و حەرامە.

ژنێك هات بۆ لای حەزرەتی عائیشە (رضيَ اللهُ عَنْها)، پاش ماوەیەك ڕۆیشت. حەزرەتی عائیشە بە دەستی ئاماژەی بۆ باڵای کورتی ژنەکە کرد، لە بەرامبەر ئەمەدا سەرداری کائینات ئەم ڕەفتارەی عائیشەی دایکمانی بە غەیبەت لە قەڵەم دا.

## خووڕەوشتی لاسایی کردنەوە

لاسایی کردنەوەی مرۆڤەکان بۆ پێکەنینی خەڵکی، غەیبەتێکی تا بڵێی ناشرینە. کاتێك یەکێك لە دایکانمان لە خزمەت پێغەمبەری ئازیزدا لاسایی کەسێکی کردەوە، ئازیزمان زۆر لەمە زویر بوو و فەرمووی ''گەر هێندەی هەموو دونیا سامانم پێبدرێت، بە گوفتار بێت یان بە کردار باس لە هەڵەی کەسێك ناکەم و لاسایی ناکەمەوە''[١]

لاساییکردنەوەی بەردەوامی قسەکردن و هەڵسوکەوت و کەموکورتییە جەستەییەکانی خەڵکی و هەوڵدان بۆ بە کەم دانانی مرۆڤەکان لە ڕێگەی کاریکاتێرە ڕیسواکەرەکانەوە کارێکی زۆر بێ بنەمایە و نیشانەی نەبوونی ڕەوشتی ئیسلامە.

ئەوەی تایبەتمەندییە مرۆییەکانی لەدەست نەدابێت دانابەزێتە ئاستێکی وەهاوە. خوای گەورە لەم بارەیەوە ئاگادارمان دەکاتەوە و

١. أبو داود، الأدب ٣٥؛ الترمذي، القيامة ٥١.

دەفەرموێت:

﴿ وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ﴾ (الهمزة: ١)

"ماڵوێرانی و تیاچوون بۆ هەرکەسێ باسی خەڵکی دەکات و ناتەیان لێدەدات بە دوای عەیب و ناتەواوییاندا دەگەڕێت و چاکە و پیاوەتییان دەشارێتەوە!".

بەم شێوەیە خوای گەورە هەڕەشە لەم تاوانبارانە دەکات و یادیان دەخاتەوە کە کۆتاییەکەیان ئاگری دۆزەخە.

## هەوڵدان بۆ خۆ بە گەورە دەرخستن لەسەر حسابی بچووککردنەوەی کەسانی دی

بەکارهێنانی دەربڕینی وەك "سوپاس بۆ خوا کە منی پاراست لە هەڵەکانی فلان کەس"، جۆرێکی ناشرین و ڕیائامێزی غەیبەتە. لەم قسانەدا ماناکانی ڕیاکاری و خۆ بەپاك دانان لە ڕێگەی خراپکردنی کەسانی تر، بەدی دەکرێت. ئەم جۆرە هەڵسوکەوتە هێندە ناشرین و نالەبارە، وەك ئەوە وایە سەرجەم ماڵەکانی گەڕەك سووتابن و خوا ماڵەکەی تۆی پاراستبێت و تۆش بە خۆشحاڵییەوە لە ناوەڕاستی گەڕەکدا بڵێیت "هەموو ماڵەکان سووتان، بەڵام ماڵەکەی من عەیبی نییە!". ئەو مرۆڤەی بەم جۆرە مامەڵە دەکات، نەفرەتی هەموو لایەك دەیگرێتەوە.

## با قسە نەکەم، جا چیت بینیووە؟!

یەکێك لە مەترسیدارترین خاڵەکانی پێ خلیسکان لەم بابەتەدا بریتییە لە غەیبەت کردن بە بەکارهێنانی ئاماژەی نەزانراو و داخراو. هەندێك کەس کاتێك باسی خەڵکی دەکەن، بۆ ئەوەی وا نیشان بدەن کە خۆیان لە غەیبەت دووردەخەنەوە، ئەم جۆرە قسانە دەکەن "گەر دەزانیت چی تری هەیە بەڵام لە ترسی ئەوەی نەبێتە غەیبەت هەمووی ناڵێم." ئەمە لە کاتێکدا قسەکردنی لەم جۆرە، غەیبەتێکی زۆر لەوە گەورەترە کە بە ڕاشکاوی شتەکانی بڵێیت. چونکە گەر بە دەربڕین و شێوازێکی نەزانراو سیفەتی خراپ بدرێتە پاڵ خەڵکی، ئەوا لە هەزار بوختان گەورەتر و مەترسیدارتر دەبێت. چونکە ڕەنگە بەکارهێنانی دەربڕینێکی نادیاری وەها جۆرەها شت بە مێشکی دوێنراودا بهێنێت "تۆ بڵێیت ئەوەی مەبەستییەتی چی بێت؟ نێربازی بێت یان زینا، کهول خواردنەوە بێت یان قومار...؟". ئوسلوبێکی لەم شێوەیە هەم پەیوەندی نێوان تاکەکان و هەم ئاشتی کۆمەڵایەتی دەخاتە مەترسییەوە. لە ڕوانگەی سنووردارکردنی ئەو شتانەوە کە بە مێشکدا دێن، ڕەنگە باسکردنی ١٠٠ کەموکووڕی کەسەکە بە ڕاشکاوی، لەم کارە سوکتر بوایە.[١]

---

١. م.فەتحوللا گولەن، لە بەشێکەوە بۆ بەشێکی تر.

## غەیبەت لە ڕێگەی میدیاوە

زیاد لە زمان، لایەنێکی تری زمانی مرۆڤ، قەڵەمە. بەکارهێنانی قەڵەم بۆ غەیبەتکردنی مرۆڤەکان شێوازێکی ترسناکی غەیبەتە. یەکێک لە بەربڵاوترین جۆرەکانی غەیبەت لەمرۆماندا، بەداخەوە ئەمەیە. لەم ڕۆژگارەماندا مرۆڤەکان لە ڕێگەی قەڵەم و میدیای بینراو و بیستراو و نووسراوەوە شیر و تیر لە یەکدی دەسوون و بەم جۆرە لە تاوانی غەیبەتەوە دەگلێن. بە داخەوە هەموو ڕۆژێك لە میدیای بینراو و بیستراودا چەندین نموونەی غەیبەت بەدی دەکەین.

ڕەوشتی ئیسلام پێمان دەڵێت کە ململانێ لەگەڵ فیکر و بیروبۆچووندا بکەین، نەك لەگەڵ مرۆڤەکان. لەم ڕوانگەیەوە پێویستە ئەوانەی لە میدیادا دەردەکەون و دەنووسن، بە شێوازێکی ئەرێنی مامەڵە بکەن و زیاد لە کەسەکان سەرنجی دوێنراوان بۆ لای هەڵە و بناغە لەرزۆکی بیروبۆچوونەکان ڕابکێشن. پێشینان دەیانوت "مرۆڤ پێناسەی ئەو شتەیە کە دەریدەبڕێت". دەبێت مرۆڤ هەموو کات پارێزگاری لە پاکیی زمانی بکات و بێ ئەوەی شێوازی خۆی تێك بدات مەبەستەکەی بگەیەنێت. ڕاستییەکی بەڵگەنەویستە کە کۆمەڵگا کاریگەرییەکی باشی تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەکانی لەسەرە، لەبەر ئەوە دەبێت ئەوانەی لە بوارە میدیاییەکاندا کار دەکەن، زۆر ئاگایان لە قسە و نووسینەکانیان بێت. بە پێچەوانەوە گوناهەکانیان لە گوناهی تاکەکەسیی دەردەچن و کۆمەڵگاش دەگرنەوە و بە تێپەڕینی کات دەبنە تاوانێکی گەورە کە باجەکەی گەلێ سەخت دەبێت.

## بە غەیبەتی نەبێت...

شێوازێکی تری غەیبەتمان هەیە کە هەوڵ دەدەین بەم شێوەیە ڕوونی بکەینەوە "هەندێك جار کەسانێك خۆیان بە بێ تاوان نیشان دەدەن و دەکەونە غەیبەت کردن. هەر دەرفەتیان بۆ ڕەخسا کەسانێك بە خراپە ناودەبەن. کاتێکیش ئەمە دەکەن بە وتەی "دڵمان هێندەی گەردیلەیەك شتی تێدا نییە، بەڵام..." دەستپێدەکەن و لە پاش خاوێن نیشاندانی خۆیان شت نامێنێت لەبارەی کەسانی ترەوە نەیڵێن. دوای دەستکەوتنی دەرفەتێکی تر ئەم جارە لەبارەی "فلان"ەوە قسە دەکات و دەرفەت دوای دەرفەت تەماشا دەکەیت بێجگە لە خۆی کەس نەما مەحکومی عەدەمی نەکات، هەموو خەڵکی خراپ کرد کەچی هێشتا دەڵێت "بە غەیبەت نەبێت..." و بەردەوام دەبێت. بمبوورن بەڵام ئەمە غەیبەتێکی هێندە دووڕووانەیە کە نموونەی نییە و گوناهێکی وەهایە کە پێویستە بەندەیەکی چاك و قوتابییەکی دڵسۆزی قورئان تا دێت لێی دووربێت. بەڵێ غەیبەتکردن بە شێوازی ناڕاستەوخۆ و بە چەماندنەوەی بابەتەکە پێچانەوەی ڕووداوەکان و نیشاندانی خود بە بێتاوانی، بە ئاشکرا نیفاقە.[1]

---

١. م.فەتحوڵلا گولەن، گۆزەی شکاو.

## مەترسیدارترین و ڕووخێنەرترین غەیبەت

یەکێك لە مەترسیدارترین و ڕووخێنەرترین جۆرەکانی غەیبەت بریتییە لە غەیبەت کردنی کەسێتی مەعنەوی یاخود غەیبەت کردنی ئەو کەسانەی لە نێو کەسێتییە مەعنەوییەکەدان. دەتوانین ئەم جۆرەی غەیبەتیش بەم شێوەیە ڕوون بکەینەوە "جۆرێکی غەیبەت هەیە کە لە مەترسیداربوون و ڕوخێنەریدا لەگەڵ جۆرەکانی دیکەدا بەراورد ناکرێت. بە جۆرێك لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا، ئاماژە بەوە کراوە کە گوناهی ئەم جۆرەی غەیبەت لە گوناهی بیست زینا گەورەترە". بۆ نموونە، غەیبەت کردنی کۆمەڵێك کەس، بزاوتێك، یاخود غەیبەت کردنی زاتێك کە نوێنەری کۆمەڵێکە، لەم جۆرە تاوانەیە. چونکە قەدەری ئەم مرۆڤە لەگەڵ کۆمەڵەکەدا یەکانگیر بووە؛ بۆیە کاتێك غەیبەتی ئەو دەکرێت، وەك ئەوە هەژمار دەکرێت کە غەیبەتی هەموو کۆمەڵەکە کرابێت.

ئەگەر هاتوو غەیبەتەکە دەربارەی مرۆڤێکی ئاسایی نەبوو، با بڵێین غەیبەتی دۆستێکی خوا وەك شاهی گەیلانی بوو، یان غەیبەتی کۆمەڵێکی بچوك و ئاسایی نەبوو، بەڵکو غەیبەتی کۆمەڵێك بوو کە حەزرەتی محمد بەهانەدینی نەقشەبەندی نوێنەرایەتی دەکات، گەر ئەم قیل و قالانەش کە بە غەیبەتی بچووك دەستیان پێکردووە، پاش ماوەیەکی کەم لە ڕێگەی میدیاوە ببنە بوختانی گەورە گەورە و بە هەر چوارلادا بڵاو ببنەوە، ئیدی ئەمە تاوانێکی هێندە گەورە دەبێت، کە (خوا بمان پارێزێت) نەك تەنها یەك بەڵکو چەندین ڕێگای بۆ کوفر لێ دەبێتەوە و ڕەنگە ببێتە هۆی دەرچوونی مرۆڤ لە

بازنەی ئیمان. بەڵێ، ئەمە تاوانێکی هێندە کوشندەیە، کە مافی حەزرەتی نەقشبەند و هەموو ئەوانەی تێدایە کە لە زنجیرە زێڕینەکەی ئەودا هەن وەك عوبەیدوڵڵای ئەحرار و، موحەممەد زاهید و، ئیمامی ڕەببانی و، عەبدوڵڵا دیهلەوی و، مەولانا خالیدی شارەزووری، هەروەها مافی ئەوانەشی تێدایە کە شوێنکەوتەی ئەمانن. چونکە ئەم زاتانە بەو ڕووناکییەی لە ماموٚستاکەیان وەرگرتووە، لە سەردەمی خۆیانەوە تا ئەمڕۆ، سەر زەوییان ڕووناك کردووەتەوە و بەردەوام ڕووناکییان پەرش کردووەتەوە؛ بە شێوەی جیا جیا بازنەیان پێکهێناوە و هەردەم چرای ڕێنوێنی بوون بۆ چواردەوریان.

ئەو کەسەی ئەم تاوانە ئەنجام دەدات، گەر بە غەیبەت کردنی کۆمەڵێك ئەم کردەوە خراپەی ناشرینتر بکات، ئەو کات زۆر ئەستەمە بێ ئەوەی یەك یەك گەردنی خۆی بە ئەندامانی نێو ئەو بازنەیە ئازاد بکات، بچێتە بەهەشتەوە. پێغەمبەری ئازیزمان دەفەرموێت "خۆتان لە غەیبەت بە دوور بگرن، چونکە غەیبەت لە زینا خراپترە. گەر مرۆڤ زینای کرد و پاشان تەوبەی کرد (گەر جارێکی دی نەیکاتەوە)، خوای گەورە تەوبەکەی قەبووڵ دەکات. بەڵام ئەو کەسەی غەیبەت دەکات هەتا غەیبەت کراوەکە گەردنی ئازاد نەکات، بەر لێخۆشبوون ناکەوێت"[1]. ئەگەرچی حەزرەتی ڕەحمان، وەك لوتفێکی زیادەی خۆی ڕەنگە لە مەحشەردا ئەو تاوانبارە بهێنێتە بەرامبەر غەیبەت کراوەکە و بفەرموێت، "گەردنی ئەم بەندەیەی من ئازاد بکە". بەڵام بێگومان بەختێکی وەها وابەستەی لوتفێکی چاوەڕوان نەکراو و ئیحسانێکی

١. المعجم الأوسط للطبراني ٣٤٨/٦.

زیادەیە و دەبێت ئەوەشمان لە یاد بێت کە ئەو بابەتانەی پەیوەندییان بە بەندایەتییەوە هەیە لەسەر لوتفە زیادەکان بینا ناکرێن.

بۆیە پێویستە ئیمانداران لە هەموو جۆرەکانی غەیبەت خۆیان بە دوور بگرن و وەك چۆن زمانیان لەو گوفتارە نابەجێیانە خاوێن دەکەنەوە، هەوڵ بدەن بیر و خەیاڵیشیان لە هەست و بیری خراپ خاوێن بکەنەوە تا سەرەنجامیان خراپ نەبێت. پێویستە بۆ خۆپاراستن لە نەگبەتیی غەیبەت کە لە زیناش خراپترە، خۆیان لە بچووکترینی قیل و قالەکان بەدوور بگرن؛ بۆ ئەوەی بە بێ ئاگای خۆیان نەکەونە نێو هەرە گەورەکەیەوە، دەبێت خۆیان لە هەرە بچوکەکەشی بگێڕنەوە. تاوەکو ئاگری دۆزەخی بەڵای خوا نەبێتە بەشیان، پێویستە هەردەم پەنا بۆ خوای گەورە ببەن و بەرامبەر سەرجەم ئافاتەکانی زمان لە ئامادەباشیدا بن.[1]

غەیبەت ئەو ڤایرۆسەیە کە نابێت لە ئیماندارێکی ئیمان دامەزراوی خاوەن کەسایەتیدا هەبێت و دالدە بدرێت. مامۆستا بەدیعوززەمان دەڵێت "غەیبەت ئەو چەکە ئاست نزمەیە کە بە زۆری ئەهلی دووبەرەکی و حەسوودی و عینادی بەکاریدەهێنن. خاوەنی عیززەتی نەفس، تەنازول بۆ ئەم چەکە پیسە ناکات و بەکاری ناهێنێت"، عەدی کوڕی حاتەمیش (رضي الله عنه) وەك مەزرای مرۆڤە سووك و نزمەکان دەیبینێت.[2]

مرۆڤە خاوەن شکۆ و عیززەتەکان بە جۆرێکی نەشیاو و نەخوازراو لە پشتی مرۆڤەکانەوە نادوێن. ئەگەر کەموکوڕی و هەڵەیەك لەواندا

---

١. مەحمەدئوڵڵا کوتەن، بانگەوازی ژیانەوە.

٢. ابن مفلح، الآداب الشرعية ٣١/١.

هەیبێت، ئەوا بە شێوازی گونجاو پێیان دەڵێن یاخود لە ڕێگەی کەسێکی سێیەمەوە ئاگاداریان دەکەنەوە. ئەو پیاوەی کە دووپشکەکە لەسەر پشتی هاوڕێکەی دەبینێت، ناچێت لە پشتەوە بە پێکەنینەوە نیشانی هاوڕێکانی بدات، بەڵکو ئاگاداری دەکاتەوە و هاوکاری دەکات لە لابردنی دووپشکەکە. ئەگەر هاوڕێکەی نەتوانێت بە تەنها لای ببات ئەوا ئەم هاوکاری دەکات. دۆست و ئیمانداری ڕاستەقینە ئاوا دەکات. پێکەنینی بەرەوڕوو و خەنجەر وەشاندنی پشتەوە کاری دۆستە ڕاستەقینەکان نییە. ئەوەتا کاتێک دووڕووەکان ئیماندارەکان دەبینن پێیان دەڵێن ﴿ءَامَنَّا﴾ (البقرة: ١٤) "ئێمەش ئیمانداریین"، کاتێکیش دووبەدوو لەگەڵ شەیتانەکانیاندا دەمێننەوە دەڵێن:

﴿وَإِذَا خَلَوْا إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمْ قَالُوٓا إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ﴾ (البقرة: ١٤)

"دڵنیا بن ئێمە لەگەڵ ئێوەداین، ئێمە بەوان ڕادەبوێرین".

دەی ناکرێت ڕەفتاری دووڕووان لە سینەی ئیمانداردا جێی ببێتەوە. ئەو ئیماندارەی خاوەنی ئیمانێکی تەواوە، لە نەبوونی براکانیدا شکۆ و شەرەفیان ناکاتە بنێشتە خۆشە. سەرڕاستانە مامەڵە دەکات و لە هەموو کات و شوێنێکدا پارێزگاری لە مافی هاوڕێکانی دەکات.

## غەیبەتی دڵ

هەموو کەسێك لە بەرامبەر خوادا بە پێی پلەو پایەکەی مامەڵە دەبینێت. هەندێك لە دۆستانی خوا تەنانەت ئەو هەست و بیرۆکە نەرێنییانەشیان بە غەیبەت هەژمار کردووە کە دەکرێت دەربارەی کەسانی تر بە خەیاڵدا بێن و بە "غەیبەتی دڵ" ناوزەدیان کردووە. ئەو مرۆڤانەی لەم ئاستەدان هەستە نەرێنیەکانی نێو ناخیشیان بە نەشیاو دادەنێن و لەبەر ئەوە داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەن.

مادەم هەموو شتێك لە هەست و بیرەوە دەست پێدەکات، ئەوا هەر لە سەرەتاوە ڕێگرتن لەو بیر و هەستانەی ئەنجامی خراپ دێننە بەرهەم، لەناوبردنیان خاڵێکی ئێجگار گرنگە. بۆ ئەوەی گومانی خراپ لە دڵدا جێگیر نەبێت و قۆناغی دواتری گومانی خراپ کە غەیبەتە، دەرگای لەسەر واڵا نەکرێت، پێویستە هەر لە سەرەتاوە پشکنینی تەواو بۆ هەست و بیرمان ئەنجام بدەین و ئەو ڕەنگانە جودا بکەینەوە کە پێیان نارەحەت دەبین، بێگومان ئەمەش هەڵسوکەوتێکی ئیماندارانەیە. بە دڵنیاییەوە ئەو خاوەن تەقوایانەی بەم وریاییەوە دەژین، خوای گەورە لە باوەشی پڕ سۆز و خۆشەویستی و ڕەحمەتی خۆییان دەگرێت.

# گۆڕەپانی هەوای بێ غەیبەت



"قوتابی دڵسۆزی قورئان، کاتێک دەبینێت
یەکێک دەمی بۆ غەیبەت دەکاتەوە،
دەبێت مەردانە هەستێت بڵێت "ماڵئاوا"
و لەو شوێنە بڕوات."

موحەممەد فەتحوڵڵا گولەن

"گۆڕەپانی هەوای بێ دوکەڵ" ئەو دروشمەیە کە لەم دواییانەدا لە میدیای نووسراو و بینراودا دەرکەوت. وەك لای هەمووان ئاشکرایە، ئەم دروشمە گوزارشت لە قەدەغەبوونی جگەرە کێشان دەکات لە شوێنە داخراوەکان و هەندێك لە شوێنە کراوەکاندا، ئەمە هەڵمەتێکە کە ئەم دەردە کوشندەیە دەکاتە ئامانج.

ناونیشانی "گۆڕەپانی هەوای بێ غەیبەت" ئیلهامی لەم پێکهاتەیەوە وەرگرتووە. لێکچوونی نێوان دروشمەکان دەگەڕێتەوە بۆ پەیوەندی نزیکی

نێوان جگەرە و غەیبەت. چونکە چەند پەیوەندییەکی گرنگ لە نێوان جگەرە و غەیبەتدا هەیە. سەرەتا غەیبەت هەر وەك جگەرە، هەم لەسەر ئاستی کەسی و هەم لە سەر ئاستی کۆمەڵایەتی، نەخۆشییەکی زیانبەخشە. لە هەمانکاتدا وەك چۆن جگەرە بە بۆنەکەی و ماددە زیانبەخشەکانی ناوی زیان هەم بە جگەرە کێشەکە خۆی و هەم بەوانەی دەوروبەری دەگەیەنێت، تەنانەت وەك چۆن ئەوانەی نزیك جگەرە کێشەکەن زیاتر دەکەونە ژێر کاریگەرییەوە، غەیبەتیش چەندەها زیان بەوەی لەسەر زاریەتی و بە گوێگرانی دەگەیەنێت.

گەر ئەوانەی گوێبیستی غەیبەت دەبن، بە ئاسوودەیی بەشداریی گفتوگۆی غەیبەت بکەن و پێی بێزار نەبن، ئەوا هاوبەشی ئەو تاوانە دەبن و بەم جۆرەش هەواکە پیس دەکەن. تۆ بڵێیت ئەوانەی غەیبەتی کەسی سێهەم دەکەن بزانن چ بۆنێکی پیسیان بە خواردنی گۆشتی مردوو بەو ناوەدا بڵاو کردووەتەوە؟ مادەم ئەوەی سیفەتە مرۆییەکانی لەدەست نەدابێت بەلای کارێکی وەهادا ناڕوات، پێویستە دووبارە بیر بکەینەوە و لە هەموو کات و شوێنێکدا هەڵوێستێکی هاوبەشمان بەرامبەر بە غەیبەت هەبێت. پێویستە بۆ لەناوبردنی نەخۆشییەکی وەها، دەرفەتی ژیان نەدەینە ئەم ڤایرۆسە و ئەوانەش ئاگادار بکەینەوە کە کەش و هەوای هەناسەدانمان بە غەیبەت پیس دەکەن.

"خالید الربعي" کە لە ساڵی ٢٢٨ ی کۆچیدا ژیاوە، ئەم ڕووداوە سەیرەمان بۆ دەگێڕێتەوە ''ڕۆژێکیان لە کۆڕێکی گەورەدا دانیشتبووم، ئەوانەی ئەوێ دەستیان کرد بە غەیبەت کردنی پیاوێك. من ڕێگریم

کردن لە بە خراپ باسکردنی ئەو کەسە. لە دوای ئەمە بابەتەکە گۆڕا بە شتێکی تر. پاش ماوەیەکی تر دیسان هاتنەوە سەر باسکردنی هەمان کەس. بەداخەوە منیش بە غەیبەت کردنی ئەو زاتە، بوومە هاوبەشی گوناهەکەیان.

ئەو شەوە لە خەونمدا کەسێکم بینی کە لە پیاوێکی دەموچاو ڕەشی زۆر باڵابەرز دەچوو. قاپێکی تەختەی بەدەستەوە بوو کە پارچەیەک گۆشتی بەرازی تێدابوو. بە منی وت "ئەمە بخۆ!". منیش وتم "گۆشتی بەراز بخۆم؟ سوێند بە خوا نایخۆم!".

پشتەملی گرتم و بە زۆر دەستیکرد بە دەرخوارد دانم. گۆشتەکەم دەجوو بەڵام بۆم قووت نەدەچوو. نەشم دەتوانی تفی بکەمەوە. لەو کاتەدا خەبەرم بووەوە. وەڵڵاهی بۆ ماوەی سی شەو و سی ڕۆژ هەر پاروویەکم دەنایە دەمم ئەو بۆنە قێزەونەم دەکرد."[١]

غەیبەت تێکەڵەیەکی هێندە نەفرین لێکراوە، گەر فڕێ بدرێتە نێو دەریاشەوە بۆنی پێ دەکات و تێکی دەدات. ئەو غەیبەتانەی بە هەستە شەیتانییەکانەوە دەکرێن، ڕەنگە بۆ ئەو کاتە شیرین دەرکەوێت و هەستێکی ئاسوودەیی دەروونی بە مرۆڤ ببەخشێت، بەڵام لە داهاتووی نزیك و دووردا زیانگەلێکی زۆر بە دوای خۆیدا دەهێنێت. وەك لیسانەوەی هەنگوینی ژەهراوی وایە. چەندە لەسەر زمان خۆش بێت، کۆتاییەکەی مردنی تەواوی بونیادی جەستە بە شوێن خۆیدا دەهێنێت. وەکە لە فەرمودە پیرۆزەکەدا ئاماژەی پێ

١. ابن أبي الدنيا، الغيبة و النميمة ٦٣-٦٤، الصمت و الآداب اللسان ١/١٢٦.

کراوە، چواردەوری دۆزەخ بە شتانی سەرنجڕاکێش دەورە دراوە.[2] هەموو جۆرێکی شەهوەت لە ناوجەرگەی دۆزەخەوە دەستی دەردەهێنێت و بە شێوازێکی سەرنجڕاکێش دەڵێت "وەرە! وەرە!"، بەڵام لە هەمان کاتیشدا خیانەتکار و درۆزن و لەخشتەبەرە. یەك لە شەهوەتەکانی زمان کە غەیبەتە، گەر لە سەرەتادا خۆشیش بێت بۆ مرۆڤ، لە کۆتاییدا هەر لەخشتەبردنە. لەبەر ئەمە پێویستە ڕاستگۆیانە سنورەکانی خوای گەورە بپارێزین و هەوڵ بدەین لەنێو بۆسە یەك لە دوایەکانی گوناھ تێبپەڕێنین و بە ماڵی بەختەوەریمان بگەین کە بەهەشتە.

وەك چۆن غەیبەت خۆی حەرامە، گوێلێگرتنەکەشی حەرامە. چەندە هاوبەشیکردنێکی خراپی گوناهە لە دانیشتنەکاندا گوێ بۆ غەیبەت شل بکرێت. لە شێوەی هەر پاکێجێکدا بووە، نابێت لە کۆڕ و دانیشتنەکانماندا ڕێگە بە هاتن و هێنانی غەیبەت بدەین. سەربەرزییەکی گەورەیە مرۆڤ ئاگای لە زمانی بێت و غەیبەت نەکات، کاتێکیش غەیبەت کرا، ئەم گوێی لێ نەگرێت، ئەمە کاری ئیمان و غیرەتە، نیشانەی مەردایەتییە. پێویستە کاتێك غەیبەتمان لەلادا دەکرێت ئەم ڕەسەنایەتییە بنوێنین و بە شێوازێکی گونجاو بڵێین "من گوێ لەمانە ناگرم، نامەوێت ئێرە بە بۆنی ناخۆشی غەیبەت پیس ببێت. تکایە بە بۆنی قورسی ئەو غەیبەتەی دەیکەن، من لێرە بێزار مەکەن!"، بەم جۆرە نابێت هاوبەشی لە غەیبەتەکەدا بکەین و پێویستە ئەوانەش ئاگادار بکەینەوە کە غەیبەت دەکەن. دەبێت لە دڵەوە تاوانەکەمان پێ ناخۆش بێت و ئەم نیگەرانییەشمان دەربخەین. بێزنەکردنەوە لەم کارە لە دڵەوە، لاوازی

---

٢. البخاري، الرقاق ٢٨؛ مسلم، الجنة ١.

ئیمان دەردەخات. گەر نەشتوانین ڕێگە لە غەیبەت کردنەکە بگرین، ئەوا هیچ نەبێت دەبێت خۆمان هەستین بڕۆین و ئەو دانیشتنە شەیتانییە جێبهێڵین. گەر ئەو جۆرە کۆڕ و دانیشتنانە جێنەهێڵین و بەشداری میواندارییە بێزراوەکانی بکەین و گرنگی بەو وتە چەپەڵانە بدەین، ئەوا ڕەنگە لە میهرەبانی خوای گەورە بێبەش ببین و بەرەکەتی ئەو خزمەتە جوانانەش کە پێشکەشی دەکەین بە هەدەر بچێت.

ئیمامی ئەوزاعی دەڵێت کە حەزرەتی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بەم جۆرە بۆ مرۆڤەکانی نێو مەجلیسەکەی دەدوا ''گەر هەر کەسێک لە ئێوە دەیەوێت ببێتە هاوڕێی من و دەردەدڵم لەگەڵدا بکات، پێویستە ئەم تایبەتمەندیانەی تێدابێت:

أ. ئەو کاتەی ڕێم ون کرد، ڕامبکێشێتە سەر ڕێی دادوەری و هێڵی ویژدان.

ب. لە بابەتی خێر و چاکەدا هاوکارم بێت.

ج. بەو مرۆڤانەم بگەیەنێت کە ناتوانن پێویستی و ناڕەزاییەکانیانم پێ بگەیەنن، یاخود داواکانیانم پێ بگەیەنێت.

د. غەیبەتی هیچ کەسێکم لە لادا نەکات.

ە. خۆی بکاتە خاوەنی ئەو ئەمانەتەی کە لە نێوان من و خەڵکدایە (ئەرکی سەرشانی بەجێ بهێنێت)

گەر ئەم وەسفانەی تێدابێت، چەندە چاکە! گەر نا، با نە لەلام دابنیشێت، نە بیشیەت بۆ لام!''

حەزرەتی عەبباس بەم جۆرە ئامۆژگاری عەبدوڵڵای کوڕی دەکات "کوڕەکەم، دەبینم ئەمیری ئیمانداران، حەزرەتی عومەر تۆ لە نزیک خۆی دادەنێت، دەتباتە مەجلیسەکانییەوە، سێ شت زۆر بە باشی لە من وەرگرە:

١. با عومەر هەرگیز درۆت لێ نەبینێت!

٢. بە هیچ جۆرێك هیچ نهێنییەکی عومەر ئاشکرا مەکە!

٣. هەرگیز غەیبەتی کەسی لەلادا مەکە!"[١]

دەربارەی ئەم بابەتە مامۆستا فەتحوڵڵا گولەن ئەم یادگارییەیمان لەگەڵدا بەش دەکات "پیاوێکی گەورە کە ئەرکێکی زۆری لە خزمەتی ئیماندا کێشابوو، دەیگێڕایەوە "ڕۆژێکیان خۆی ڕۆیشتبوو بۆ لای مامۆستا بەدیعوززەمان تا هەواڵی دەربارەی چەند بابەتێك پێ بدات و نارەزاییش دەربارەی بابەتێك دەربڕێت. لەو کاتەدا کە دەیەوێت دەست بە قسەکانی بکات، مامۆستا (بە شێوازە ڕەتکردنەوە تایبەتییەی خۆی) پێی دەڵێت "کاکە گیان من هیچ نازانم". پاش ماوەیەك ئەو زاتە دەرفەتێك دەدۆزێتەوە و دووبارە دەیەوێ قسە بکات، مامۆستا دیسان دەڵێت "کاکە گیان من هیچ نازانم" کە دووبارە دەیڵێتەوە، دیسان ڕووبەڕووی هەمان وەڵام دەبێتەوە "کاکە گیان من هیچ نازانم."

لە کاتێکی تردا، یادگارییەکی هاوشێوەم لە برایەکی تر گوێ لێبوو، ئەویش وتی "ڕۆژێکیان چوومە لای مامۆستا. ڕەنگبوو بۆ مەبەستی چارەسەری بابەتێك شتانێك بڵێم کە گوزارشت لە غەیبەتکردنی کەسانێك بکات. مامۆستا نەیدەزانی من دەمەوێت چ بابەتێك باس بکەم.

---

١. ابن مفلح، الآداب الشرعية ٤٦٧/٣.

هەر دەستم بە قسە کرد، وتی "کاکە گیان من نامەوێت گوێ بگرم" و بابەتەکەی داخست. من پێداگریم لەسەر باسکردنی کرد؛ ویستم وردە وردە بچمە نێو بابەتەکەوە بەڵام ئەو لە هەموو جارەکاندا وتی "کاکە گیان من نامەوێت هیچ لەمەڕ ئەم بابەتە ببیستم" بەم جۆرە نەیهێشت تەنانەت یەك ڕستەش دەربارەی کەسانی دیکە بوترێت"

لە پاش گێڕانەوەی ئەم یادگارییە، مامۆستا فەتحوڵڵا بەم جۆرە ڕێنوێنی دەکات "هەڵسوکەوتەکەی مامۆستا، هەڵوێست وەرگرتنە لە بەرامبەر گومانبردنی خراپ و غەیبەت کردن و حوکمدان لەسەر مرۆڤەکان بەپێی زانیاریی بێ بنەما. پێم وایە گەر ئێمەش لە چەند شوێنێك ئاوا وانە بڵێینەوە، دەرفەت نەدەین بێجگە لەو بابەتانەی پەیوەندییان بە ئەرکەکەمانەوە هەیە، قسەی ترمان لەلادا بکرێت، ئەوا مەیدانی دەربڕینی گومانبردنە خراپەکان و غەیبەت کردن بۆ خۆی تەسك دەبێتەوە. فراوانبوونی مەیدانی ئەو جۆرە مرە مرانە کەمێکیش بۆ چاوپۆشی ئێمە دەگەڕێتەوە. قوتابی دڵسۆزی قورئان، کاتێك دەبینێت یەکێك دەمی بۆ غەیبەت دەکاتەوە، دەبێت مەردانە هەستێت، بڵێت "ماڵئاوا" و لەوشوێنە بڕوات. گەر بەم هەڵوێستە باوەڕدارانەیەوە چەند جارێك مەجلیسەکانی غەیبەت جێبهێڵن، بەوانەی گومانی خراپ دێننە سەر زار بڵێن "خواتان لەگەڵ!" و جێیان بهێڵن، بە تێپەڕینی کات ئەوانیش هەوڵ دەدەن لەلای ئێوەدا لە شتانی وەها نزیك نەکەونەوە. بەداخەوە، لەبەر ئەوەی ئێمە چاوپۆشی و لێبووردەیی لە بابەتێکدا بەکاردەهێنین کە نابێت لێبووردەیی تێدا نیشان بدرێت، بۆیە بەم جۆرە هەر خۆمان مەیدانی جوولەی غەیبەتکاران و بوختانچییەکان بە فراوانبوون

دەدەین،[1] فریشتە و ڕۆحانییەکان حەزیان لە بۆنی خۆشە، سەردانی شوێنە خاوێنەکان و ئەو مەجلیسانە دەکەن کە بە یادی خوا ڕازێنراونەتەوە. لەوێ تێر تێر بۆنی گفتوگۆی خواناسی گیانی بە گیانی هەڵدەمژن. پێویستە کەشێکی خاوێن لە غەیبەت لە دانیشتنەکانماندا بڕەخسێنین تا ڕۆحانییەکانیش ڕووی تێ بکەن، دانیشتووانی مەلەئی ئەعلا سەردانمان بکەن، ئاسوودەیی نازمان و دڵنیایی دڵمان پێ ببەخشن ئینجا بڕۆن. بە پێچەوانەوە گەر کاتەکانمان لەگەڵ هاوڕێکانماندا بە گفتوگۆی گیانی بە گیانی بەسەر نەبرد و کەوتینە غەیبەت کردنی ئەم و ئەو یان فلانە کەس و کۆمەڵ، ئەوا وەك چۆن داڵەکان دەوری لاکە تۆپیوێك دەدەن ڕۆحە خراپەکان ئەو شوێنە داگیر دەکەن و هەوای کۆڕ و دانیشتنەکەمان تێکدەدەن و نائارامی و خەم و گومان لە دڵماندا جێدەهێڵن.

با پەیمانی ئەوە بە خۆمان بدەین کە ئیدی کۆڕەکانمان لە غەیبەت بپارێزین، پەیمان بدەین کە شوێنەکانمان ببنە شوێنی ڕووتێکردنی ڕۆحی خاوێن و فریشتەکان، تا ژیانمان پڕ بەرەکەت بێت و ناخمان بحەسێتەوە و یارمەتی خواییش یار و یاوەرمان بێت".

حەزرەتی جابر (رضيَ اللهُ عَنْهُ) دەربارەی بابەتەکەمان، ڕووداوێکی گرنگمان بۆ دەگێڕێتەوە کە بەسەر خۆیدا هاتووە "کاتێك لەگەڵ پێغەمبەری خوادا پێکەوە بووین، بۆنێکی زۆر پیسی لاکی تۆپیو ڕووی لەو ناوە کرد. لەسەر ئەمە پێغەمبەری ئازیز فەرمووی "دەزانن ئەمە بۆنی چییە؟"، خۆی وەڵامی دایەوە و فەرمووی "ئەمە بۆنی ئەوانەیە

---

۱. م.فەتحوڵلا گولەن، بارانەکانی پاش نیوەڕۆ.

کە غەیبەتی ئیمانداران دەکەن"[1] پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کە چاو و گوێ و سەرجەم لایەنە ناسکەکانی بە ویستی خوای گەورە بە ڕووی جیهانی مولك و مەلەکوتدا کرابووەوە، هەستی بەو بۆنە بێزراوەی غەیبەت کردبوو و ئیماندارانی لێ ئاگادار کردبووەوە. چۆن وەك ئیمانداران هەر کردەوەیەك لە دونیادا ئەنجامی دەدەین هاوتا و ئاوێنەیەکی لە جیهانی میسالدا هەیە، گوناهێکی چەپەڵیش بێگومان دەرکەوتەیەکی لە شێوەی بۆنێکی بۆگەندا هەیە. ڕابەری ئازیز باسی بۆنی ئەو هەوایەمان بۆ دەکات کە لە مەجلیسی غەیبەتەوە دێت و دەفەرموێت "غەیبەتی ئیمانداران مەکەن و دووربکەونەوە لەو مەجلیسانەی کە غەیبەتی ئەوانی تێدا دەکرێت!"

کاتێك غەیبەتی برایەکمان دەکرێت و قسەی بەرز و نزم بە کەسایەتی مەعنەوی ئەو دەوترێت، بەڕاستی جوامێرییەکی گەورەیە ئێمە لەوێدا خۆمان بکەینە خاوەنی و پارێزگاری لە مافی ئەو بکەین. چونکە پێغەمبەری خوا دەستخۆشی لەم مەردی مەیدانانە دەکات و مژدەیان پێدەدات "ئەو کەسەی ڕێ لە لەکەدارکردنی شەرەف و ناموسی برا موسوڵمانەکەی دەگرێت، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا لە ئاگری دۆزەخ دووری دەخاتەوە".[2]

ئیماندار چەندە پەرۆش و هەستیارە تا شەرەف و شکۆی خۆی نەکەوێتە سەر زاری خەڵکی، دەبێت ئاواش هەستیار و بە پەرۆش بێت بۆ پارێزگاریکردن لە شەرەف و شکۆی کەسانی تر. چەندە پارێزگاری

---

١. أحمد بن حنبل، المسند ٣٥١/٣.

٢. الترمذي، البر ٢٠.

لە عیززەتی نەفسی خۆی دەکات، ئەوەندەش عیززەتی براکەی بپارێزێت و، گومانی باشی پێ ببات و ئەو شتەی بۆ خۆی نایەوێت بۆ خەڵکی تریش نەیەوێت. ئەسمای کچی یەزید (رضيَ اللهُ عَنْها) ئەم فەرموودەیەمان بۆ دەگێڕێتەوە "ئەوەی لە نەبوونی براکەیدا بەرگری لە گۆشتی بکات (ڕێگە لە غەیبەتی بگرێت)، خوای گەورە ئەو کەسە لە دۆزەخ ئازاد دەکات"[1]

ئەو کەسەی لەکاتێکدا شەرەف و شکۆی براکەی لەکەدار دەکرێت. خۆی دەکاتە خاوەنی، لە دۆزەخ ڕزگاری دەبێت و گەر لە ئەهلی بەهەشتیش بێت، ئەوا پلەوپایەکەی بەرز دەکرێتەوە و نیعمەتەکانی خانەی بێکۆتایی زیاتر دەچێژێت.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رضيَ اللهُ عَنْهُ) بە شێوازی خۆی باسی ئەم بابەتە دەکات و دەفەرموێت "هەر کەسێك غەیبەتی ئیماندارێکی لەلادا بکرێت و ئەویش لەوێدا خۆی بکاتە خاوەنی و بەرگری لێ بکات، خوای گەورە جوانترین پاداشتی هەردوو دونیای دەداتەوە. گەر پێچەوانەی ئەمەش بکات، ئەوا هەم لە دونیا و هەم لە دوارۆژیشدا خراپترین مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت. هیچ کەسێکیش لەو پاروەوە خراپتری نەخواردووە کە بە غەیبەتی براکەیەوە قووتی دەدات".[2]

کاتێك حەزرەتی عومەر لە خەڵکی پرسی "بۆچی کاتێك کەسێك دەبینن شەرەف و ناموسی مرۆڤەکانی هێناوەتە سەر زاری ڕێگری لێ ناکەن؟" ئەوانیش لە وەڵامدا وتیان "لە زمانیان دەترسین، خەمی ئەوەمانە

١. أحمد بن حنبل، المسند ٤٦١/٦؛ طبراني، مجمع الكبير ١٧٥/٢٤.

٢. البخاري، أدب المفرد ٢٥٥/١.

بچن لەمەلا و لا غەیبەتی ئێمەش بکەن" لە وەڵامدا حەزرەتی عومەر فەرمووی "با غەیبەتان بکەن! ئەوە هەڵبژاردنێکی دروستترە لەوەی گوێ بۆ غەیبەت بگرن"[1] بەم جۆرە جەختی لەسەر ئەوە کردووەتەوە کە پێویستە هەوڵی ڕاگرتنی ئەو کەسانە بدرێت کە غەیبەت دەکەن.

کۆمەڵگەیەک کە ئەندامانی خاوەندارێتی لە یەک نەکەن و عەیب و عاری یەکتر دانەپۆشن، ئەمڕۆ یا سبەی بۆشایی دەکەوێتە نێوان ئەو خشتانەوە کە کەسێتی مەعنەوی ئەو کۆمەڵگەیەی پێک هێناوە و لە ماوەیەکی کەمدا پێکهاتەکەی دەڕزێت و دادەڕمێت. ئیمانداران وەک خشتەکانی نێو یەک دیوار، قەدەریان بە یەکەوە گرێ دراوە. گەر ئەم خشتانە نەبنە پاڵپشتی یەک و پشتی یەک نەگرن، درز دەکەوێتە نێوانیان و ڕەنگە پاش ماوەیەک تەلاری گەورەی ئیسلام ڕووبەڕووی مەترسی گەورە بکەنەوە. بۆیە دەبێت هەموو ئیماندارێک پارێزگاری لە مافی براکەی بکات و، دەرفەت بەوانە نەدات کە بە نەشیاوی باسی دەکەن و هەر لە سەرەتاوە هەڵوێستی خۆی لەم بارەیەوە نیشان بدات.

خوای گەورە بە پێغەمبەری فەرموو:

﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِى حَدِيثٍ غَيْرِهِۦ ۚ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ ٱلشَّيْطَٰنُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ ٱلذِّكْرَىٰ مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ (الأنعام: ٦٨)

"کاتێک ئەوانەت بینی کە دەم لە ئایەتەکانی ئێمەوە دەدەن و (دەیکەنە گاڵتەجاڕیی خۆیان)، ئەوە تۆ پشتیان تێ بکە و کۆڕ و کۆبوونەوەیان بەجێ بهێڵە هەتا ئەو کاتەی دەچنە ناو باسێکی ترەوە،

[1] ابن أبي شيبه، المصنف ٥/٢٣٠.

کاتێکیش شەیتان لە بیری بردیتەوە (کە دوور بکەویتەوە لێیان) جا دوای ئەوەی کە بیرت هاتەوە لەگەڵ قەومی ستەمکاردا دامەنیشە"

بۆیە دەبێت ئێمەش ڕەچاوی ئەم فەرمانە بکەین.

دەبێت لەو شوێنانە دانەنیشین کە ڕەزامەندی خوای لێ نییە. مادەم ئیماندارین و بەڵێنی ئەوەمان داوە کە بە گوێرەی پێوەرەکانی خوای گەورە شکڵ و شێوە بە ژیانمان ببەخشین، ئەوا دەبێت خاتری خوای گەورە لە پێش هەموو شتێک دابنێین و بەشداری ئەو تاوانە نەکەین کە لەوێدا ئەنجام دەدرێت.

عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) داواکارییەکی زۆر قووڵ و کاریگەری شانازی مرۆڤایەتیمان پێ ڕادەگەیەنێت. پێغەمبەری ئازیز دەفەرموێت "با هیچ کام لە هاوڕێیانم شتی نەشیاوی کەسێکی ترم بۆ باس نەکات. چونکە دەمەوێت بە دڵێکی بێ خەوش و (بێ ئەوەی هیچ جۆرە هەستێکی نەرێنیم بەرامبەرتان هەبێت) بێمە نێوتان (یان بچمە حزووری پەروەردگارم)."[1]

پێغەمبەری ئازیزمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)، هەرگیز نەیدەویست ئەو تەختە تایبەتانە تێک بشکێن کە لە نێو دڵی فراوانیدا هاوەڵانی لەسەر دانابوو. دڵی ڕازی نەدەبوو بەوەی ئەو هەستە دڵسۆزانەیەی بەرامبەر هاوەڵانی هەیەتی، کەڵێنی تێبکەوێت. ویستی هەم لە دونیا و هەم لە دوارۆژدا بە گومانباشییەوە شایەتی بۆ هاوڕێکانی بدات و دەریخست کە خۆشنوود نابێت بە پیس بوونی ئەم هەستە خاوێنانە.

---

١. أبو داود، الأدب ٢٨؛ الترمذي، المناقب ٦٣.

بیهێننە پێش چاوی خۆتان چۆن دونیای خەیاڵ و ڕۆحتان تێک دەشکێت کاتێک کەسێکی سێهەم دێت و شتانێکی نەرێنیتان لەبارەی مرۆڤێکی ئازیزتانەوە پێدەڵێت کە ئێوە هەستی قووڵ و دڵسۆزانەتان بەرامبەری هەیە. ڕەنگە ناختان بسوتێت، هەستی ڕووخانی متمانە پەردەی نائومێدی بەسەر دونیای ڕۆحتاندا دەدات و دونیاش سەرەڕای هەموو فراوانییەکەی، دەبێتە شوێنێکی تەسك بۆتان. جا بۆیە ئەستەمە دڵێکی هەستیاری وەك دڵی پێغەمبەری ئازیز ئازار نەچێژێت لە ئەنجامی ڕووخاندنی ئەو گومانباشییەی بەرامبەر هاوڕێیانی لە دڵیدا گۆشی کردووە. مادەم وایە با قەڵای مەحکەمی گومانباشی کە لە بەرامبەر مرۆڤەکاندا چین چین بنیاتمان ناوە، بە هیچ و خۆڕایی نەڕوخێنین و نەهێڵین شەپۆلی تێکدەر بچێتە سەر ئەو لەرەلەرانەی پەیوەندی نێوان دڵەکان ڕێکدەخەن. با هەمووان بە هەست و خەیاڵی خاوێنەوە لە یەکدی بڕوانن و هەموو کەس لە دڵەوە یەکتری خۆشبوێت. هەموو کەسێك دڵی خۆی بکاتە ئاوێنەی دڵی براکەی و دڵی خۆی لە نێو دڵی براکەیدا ببینێت. ئەوەی دەیەوێت بە ئاسوودەیی دڵەوە بە خوای گەورە شادبێت، با مەرجی ئەوە بۆخۆی دابنێت کە گوێ بۆ باسی کەسانی دی و ئەو بابەتانەی پەیوەندییان پێوەی نییە، ڕانەدێرێت. بەتایبەتی پێویستە ئەو برایانەی لە ڕێگەی خوادا هاوبەشی قەدەرن لەمەڕ ئەم بابەتە زۆر هەستیار بن.

با لێرەدا ئەوەشمان لە یاد نەچێت کە گەر لە پێناو بەها نەتەوەیی و مەعنەوییەکانماندا و بۆ سوودی کۆمەڵگاکەمان کۆمەڵێك خزمەت ئەنجام بدەین و لە یەکەیەکی ئەو خزمەتەدا بەرپرسیارێتییەکمان لەسەر

شان بێت، ئەوکات گوێگرتن لە کێشەکان و چارەسەرکردنیان ئەرکی ئێمە دەبێت. لەم جۆرە دۆخانەدا ڕەنگە هێندەی بڕی پێویست و لە چوارچێوەی کێشەکەدا ڕاوێژ و بیروڕا گۆڕینەوە ناچار بێت. بەڵام تەنانەت لەم دۆخانەشدا دەبێت ئاگاداری ئەوەبین کە نەکەوینە نێو کێڵگە میناوییەکەوە. ئەوەتا پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) چەندین بابەتی بەبێ ناوهێنان چارەسەر کردووەو لەمەشدا دەبێتە نموونەیەکی باڵا بۆ ئێمە.

مامۆستا فەتحوڵلا گولەن لە ڕێگەی گێڕانەوەی بەسەرهاتێکەوە پێمان دەڵێت کە پێویستە چەندە ئاگاداری ئەم بابەتە بین "ساڵانێك لەمەوپێش بوو. یەکێك لە هاوڕێیانمان خەریکبوو دەکەوتە نێو چاڵی گوناهێکەوە و دووچاری تەڵەکە و پیلانی شەیتان دەبوو. یەکێك لە نزیکەکانی ئەو هاتبوو و هەواڵی مەترسییە چاوەڕوانکراوەکەی پێداین. تەواو کەوتبووینە نێو خەمی ئەوەی براکەمان دووچاری وەها بەڵایەك بێتەوە بۆ ئەوەی بزانین دەتوانین چی بکەین بۆ ڕزگارکردنی براکەمان لەم دۆخە بەبێ زیان، بە پێویستم زانی ڕاوێژ لەگەڵ دوو سێ کەسدا بکەم. سێ کەسم بانگ کردە ژوورەکەم و پێم وتن "چۆن دەتوانین ئەم بابەتە چارەسەر بکەین؛ چی بکەین بۆ پاراستنی شکۆ و شەرەفی هاوڕێکەمان؟.." کاتێك ڕاوێژەکەمان کۆتایی هات و ئەوان لە ژوورەکەم چوونەدەر، هەستێکی قووڵی پەشیمانی لە ناخمدا سەریهەڵدا، بە خۆمم وت "ئاخ". چونکە ڕەنگە توانیبام بە بینینی تەنها یەك کەسیش بابەتەکە چارەسەر بکەم. بۆچی من لە زیادە بابەتێکم دەربارەی ئەو مرۆڤە بە دوو کەس ڕاگەیاند کە وەك خەوشێك دەبینرێت و ڕەنگە ببێتە

هۆکاری گومانخراپی و شەرمەزاربوونی ئەو مرۆڤە؟ ئایا بەس نەبوو تەنها بە یەك کەس بڵێم؟ ئایا نەدەبوو مرۆڤێکی خاوەن متمانە ببینم و پێی بڵێم "چی بکەین تا ئەو دووپشکە لە سەر شانی ئەو مرۆڤە لابدەین و دووری بخەینەوە؟!" بەم جۆرەش هەوڵبدەم لە تەسکترین بازنەدا بابەتەکە چارەسەر بکەم؟

دڵنیا بن، سەرەڕای تێپەڕبوونی ساڵانێك، هەرکاتێك ئەو بابەتەم بە یاددا دێتەوە هەستێکی قووڵی پەشیمانی دامدەگرێت، خەمبار دەبم و هەرگیز لەو بابەتەدا لە خۆم نابوورم."[١]

گەر بابەتەکە پەیوەندیدار بێت بە ئێمەوە و بچێتە چوارچێوەی مافی گشتی و مافی خواوە، ئەوا با گوێی بۆ ڕادێرین و لە کاتی خۆیدا چارەسەری بکەین، بەڵام وەرن با بەڵێن بدەین دەرگاکانمان بە ڕووی ناڕەزایی و غەیبەت لەمەڕ ئەو بابەتانەدا دابخەین کە پەیوەندییان بە ئێمەوە نییە. گرنگترین شت کە پێویستە لە چارەسەر و باسکردنی کێشەکاندا ئاگاداری بین، خۆ دوور گرتنە لە غەیبەت. با ڕێگە نەدەین ئەم سیفەتە کافرانەیە لە سینە ئیماناوییەکاندا جێگیر ببێت. دەبێت بزانرێت کە غەیبەتیش لانی کەم هێندەی زینا حەرامە. بۆ ئەوەی ڕێگربین لەبەردەم بڵاوبوونەوەی ئەم دەردەدا، با لە هەموو دەرفەتێکدا هەڵوێست بەرامبەر ئەو مرۆڤانە وەربگرین کە غەیبەت دەکەن. با ڕێگە نەدەین ئەوان قسە بکەن. با هەموو شوێنەکانمان بکەینە شوێنی نەگونجاو بۆ بڵاوبوونەوەی ڤایرۆسی غەیبەت. با وەك چۆن لە مار و

---

١. م.فەتحوڵڵا گولەن، بانگەوازی ژیانەوە.

دوپشك هەڵدێین، هەروا لەم ڤایرۆسی غەیبەتەش هەڵبێین کە بونیادی کۆمەڵایەتیمان کەساس دەکات.

نابێت ئەوەمان لە یاد بچێت کە یەکێك لەو تایبەتمەندییە ئەخلاقییانەی پێویستە لە ئیماندارادا هەبێت سەرقاڵ نەبوونە بە وتەی بێسوود و کاری بێسوودەوە، ڕێکخستنی کاتە لەو چوارچێوەیەدا کە پەروەردگار دەیەوێت. ئەو کۆڕانەی کە تەنها باسی بابەتە دونیاییەکانیان تێدا دەکرێ و، قاقای بێ کۆتایان لێ بەرز دەبێتەوە و غەیبەتی مرۆڤەکانیان تێدا دەکرێت، دوورن لە ڕەحمەتی خوای گەورەوە، نە فریشتە بەڕێزەکان و نە ڕۆحانییەکان نابنە میوانی ئەم مەجلیسانە. جەنابی حەق ئاگادارمان دەکاتەوە کە پێویستە ئیمانداران لەم جۆرە کۆڕانە بەدوور بن

﴿ وَإِذَا سَمِعُواْ ٱللَّغْوَ أَعْرَضُواْ عَنْهُ وَقَالُواْ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِى ٱلْجَٰهِلِينَ ﴾ (القصص: ٥٥)

"کاتێك قسەی بێمانا و ناشرین دەبیستن ڕوخساریان وەردەگێڕن و خۆیان دوور دەگرن و دەڵێن "کارەکانی ئێمە هی ئێمەیە و ئەوانەی ئێوەش هی ئێوە. سەلام لە ئێوە بێت. ماڵئاوا! ئێمە ئارەزووی هاوڕێیەتی لەگەڵ جاهیلاندا ناکەین".

وە دەفەرموێت:

﴿ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ﴾ (المؤمنون: ٣)

"ئیمانداران ڕوخساریان لە شتی بێهودە و بێسوود وەردەگێڕن".

وەك موسوڵمانان، پێویستە لەسەرمان کە سەرجەم ئەو نیعمەتانەی پێمان بەخشراوە لە پێناوی خوادا بەکاریان بهێنین. خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ ثُمَّ لَتُسۡـَٔلُنَّ يَوۡمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ﴾ (التكاثر: ٨)

"دواتر ئەو ڕۆژە لێپرسینەوەی نیعمەتەکانتان لەگەڵدا دەکرێت!"

بێگومان لەو ڕۆژەدا یەزدانی مەزن ئەوەی زمان وتوویەتی و ئەوەی گوێیەکان بیستوویانە، دەخاتە بەردەم و بە گوێرەی ئەوە مامەڵەمان لەگەڵدا دەکات. قورئانی پیرۆز پێمان ڕادەگەیەنێت کە

﴿ إِنَّ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡبَصَرَ وَٱلۡفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا ﴾ (الإسراء: ٣٦)

"ئەندامەکانی وەك گوێ و چاو و دڵ لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێ لەسەر ئەوەی کردوویانە."

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا بووە میوانی ماڵی عیتبانی کوڕی مالیك (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) و لەوێ پێشنوێژی بۆ کردن. پاش نوێژ هەمووان لە چواردەوری پێغەمبەری خوادا دانیشتن و چاوەڕێی نمەکانی حیکمەت بوون تا لەو کانیاوە شیرینەی زاری موبارەکیەوە وەك شەکر و شەربەت هەڵبقوڵێت. لەو کاتەدا یەکێك لە ئامادەبووان پرسی "مالیکی کوڕی دوخشوم لە کوێیە؟"، لە وەڵامدا کەسێکی تر وتی "ئەو دووڕوویە کە خوا و پێغەمبەرەکەیی خۆش ناوێت".

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) هەر کە ئەمەی بیست فەرمووی "وا مەڵێ! نابینیت کە ئەو تامەزرۆی ڕەزامەندی خوایە و دەڵێت "لا اله الا الله". خوای گەورە ئاگری جەهەننەمی لەو کەسە حەرام کردووە کە دەڵێت "لا اله الا الله"."[1]

---

1. البخاري، الصلاة ٤٥، ٤٦، الأذان، ٤، ٥، ١٥٣، ١٥٤، التهجد ٢٥، ٣٣، ٣٦، المغازي ١٢، ١٣، الأطعمة ١٥، الرقاق ٦؛ مسلم، الأمان ٥٤، ٥٥، كتاب المساجد ٢٦٣، ٢٦٤، ٢٦٥.

پێغەمبەری خوا (عَلَيهِ أَفضَلُ الصَّلاةِ وَأَتَمُّ التَّسلِيم) بەم وتەیەی، لە دەمی ئامادە نەبوونی هاوڕێکەیدا داکۆکی لە مافی دەکات و وانەیەکی گرنگیش دەداتە ئەوانەی لەوێن. غەیبەتکردنی موسوڵمانێك بە بیانووی ئەوەی نارەزوومەندی بابەتێك نییە کە جێی بایەخی موسوڵمانانە یاخود بە بیانووی ئەوەی لە شوێنێك ئامادە نەبووە کارێکی نەشیاوە، لە هەمان کاتدا گەر شتانێکی نەشیاو دەربارەی کەسێك وترا، ڕێگرتن لێی لە پێشدا ئەرکی گەورەکانە و پاشانیش سەرجەم ئەندامانی تری ئەو دانیشتنە.

یەکێك لەو سێ کەسەی بابەتی ئایەتی (١١٨) ی سورەتی "التوبە"ن، حەزرەتی کەعبی کوڕی مالیکە (رَضِيَ اللهُ عَنهُ). سەرەڕای ئەوەی ئیماندار بوو، بەشداریی غەزای تەبووکی نەکرد و دواتریش بە ماوەیەکی تاقیکردنەوەی پەنجا ڕۆژییدا تێپەڕی. کاتێك لە کۆتایی ڕۆژی پەنجاهەمدا هەواڵی قەبووڵ بوونی تەوبەی حەزرەتی کەعب و دوو هاوڕێکەی تری هات، ئەم هاوەڵانە وەك ئەوەی تازە لە دایك بین و تازە موسوڵمان بووبن خۆشییەکی بێ هاوتا دایگرتن.

ئیسلام لە بارودۆخێکی سەخت و ناهەمواردا سەفەری تەبووکی ڕێکخست و لەوێ لایدا. کاتێك پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) لە نێو هاوەڵانیدا دانیشتبوو چاوی بۆ کەعب گێڕا و پرسی "کەعبی کوڕی مالیك چی کرد؟" پیاوێك لە هۆزی بەنی سەلیمە بەم جۆرە وەڵامی دایەوە "ئەی نێردراوی خوا! خۆویستی و خۆ بە گەورەزانینی وای کرد لە مەدینە بمێنێتەوە." بەم جۆرە بەم وتەیەی غەیبەتی برایەکی کرد کە لەوێ نەبوو. لەسەر ئەمە موعازی کوڕی جەبەل بە پیاوەکەی

وت ''چەند خراپت گوت!!'' و پاشان ڕووی کردە سەروەرمان و فەرمووی ''ئەی نێردراوی خوا! ئێمە هەردەم شتانی باشمان دەربارەی ئەو زانیوە''. بەم شێوەیە بەرگری لە حەزرەتی کەعب کرد کە دواتر بە نموونەی ڕاستگۆیی و وەفا ئایەتی پیرۆزی لەسەر نازڵ دەبوو. پێغەمبەری خوا لە وەڵامی موعازدا هیچی نەفەرموو و بە بێدەنگی گوێی لە موعاز گرت کە پاڵپشتی خۆی بۆ براکەی دەربڕی.[1]

بەڵێ، ئەوەی دەکەوێتە سەرمان غەیبەتکردنی هاوڕێکانمان نییە وەک ئەو پیاوەی سەر بە هۆزی بەنی سەلیمە کردی بەڵکو بەرگریکردنی مەردانەیە لە هاوڕێکانمان وەک حەزرەتی موعازی کوڕی جەبەل. خوای گەورە هاوڕێی وەها بە هەمووومان ببەخشێت و وەک حەزرەتی موعاز بمانکاتە مرۆڤی خاوەن کەسایەتی بەرز.

١. البخاري، المغازي ٧٩؛ مسلم، التوبه ٥٣.

# غەیبەتە یان غەیبەت نییە؟!



"پیاوی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە ئەمانەت دەپارێزێ و، خۆی بە دوور دەگرێت لە باسکردنی شەرەف و شکۆی خەڵی."

حەزرەتی عومەر (رضيَ اللهُ عَنْهُ)

غەیبەت، بە تەواویی ناشیرین و گوناهە بەڵام ئەم قەدەغەکراوە چەند هەڵاوێرد (إستثناء)ێکی هەیە:

## کاتێک زوڵملێکراوێک دەیەوێت مافی خۆی لە لایەنی پەیوەندیدار بسێنێت

بەدیعوززەمان لەو وتەیەیدا کە لە لای بەرپرسێك لە شێوەی گازندەدا دەڵێت، تا هاوکاری بکات بۆ لابردنی ئەو خراپ و چەپەڵییە و مافی خۆی لەو وەربگرێت، گەر کەسێکی مافخوراو و ستەملێکراو بۆ لابردنی

ئەو ستەمەی دووچاری هاتووە بچێت بۆ لای کەسێك کە توانا و دەسەڵاتی لابردنی زوڵمەکەی هەیە و سکاڵای حاڵی خۆی لا بکات و دەستەواژەی وەك "فلانە کەس ناهەقی وا و وای لەگەڵدا کردم" بەکاربهێنێت ناچێتە چوارچێوەی غەیبەتەوە. بە پێچەوانەوە لێرەدا بابەتەکە بابەتی لەناوبردنی ناهەقی و نادادپەروەرییە. لە دۆخی لەم جۆرەدا دەبێت ئەو بابەتەی ناڕەزایی لەسەرە بگەیەنرێتە لایەنی پەیوەندیدار و داوای چارەسەری کێشەکەی لێ بکرێت. خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿لَّا يُحِبُّ ٱللَّهُ ٱلْجَهْرَ بِٱلسُّوٓءِ مِنَ ٱلْقَوْلِ إِلَّا مَن ظُلِمَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا﴾

(النساء: ١٤٨)

"خوای گەورە هەرگیز حەزی لەوە نییە قسەی ڕەق و بریندارکەر بە ئاشکرا بوترێ، بەڵام گەر ئەوەی دەیڵێ زوڵملێکراو بێت، ئەوە جیاوازە".

بەم جۆرە ئاماژە دەدات بەوەی کە مرۆڤی مافخوراو دەتوانێت ناڕەزایەتیەکەی باس بکات. ئەوەی دەبێت لێرەدا سەرنجی بدەین ئەوەیە کە نابێت باز بدەینە نێو ئەو مەیدانانەی کە پەیوەندییان بە بابەتی ناڕەزایەتیەکەوە نییە و، تەنها دەبێت لە ڕێگەی باسکردنی بابەتی ناڕەزایەتیەکەوە داوای چارەسەر بکرێت.

بۆ نموونە گەر کەسێك پارەی لای یەکێك بوو و نەیتوانی وەریبگرێتەوە، دەتوانێت بچێتە دادگا و سکاڵا لەسەر ئەو کەسە تۆمار بکات. چونکە پێغەمبەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) نەدانەوەی قەرزی بە ستەم داناوە لە کاتێکدا کەسەکە توانای هەبێت. ئاکامی ئەم دۆخەش هەم سزادانی کەسەکە و هەم غەیبەتکردنی، واتە سکاڵا لە دەست کردنیەتی. چونکە

ئەوەی قەرزەکەی داوە دەتوانێت داوای مافی خۆی بکات و بابەتەکە بگەیەنێتە لایەنی پەیوەندیدار.[1] بۆیە غەیبەت نییە کاتێك ئەوەی پارەکەی داوە بە قەرز دەچێت سکاڵای قەرزدارەکە لای حاکم دەکات یان بۆ چارەسەری کێشەکە سەر لە خاوەن پلە و پۆستێکی دی دەدات و عەرزی حاڵی خۆی دەکات. بەڵام پێویستە ئەو پلە و پایەیەی پەنای بۆ دەبات، ئەو توانایەی هەبێت کێشەکەی بۆ چارەسەر بکات. گونجاو نییە بچێت بۆ لای کەسانێك کە توانای چارەسەری کێشەکەیان نییە و غەیبەتیان لەلا بکات.

## سکاڵاکردن بۆ لەناوبردنی خراپەیەک یاخود بۆ خستنەوە سەر ڕێی کەسێک کە لە ڕاستەڕێ لایدابێت.

پەنابردن بۆ کەسێك کە بڕوامان وایە توانای چارەسەری کێشەی کەسێکی هەیە و وتنی ئەوەی "فلانە کەس ئەم کارە خراپانە ئەنجام دەدات، لەو کارانە دووری بخەرەوە و ڕزگاری بکە!"، نابێتە غەیبەت، بەڵکو دەبێتە کردەوەیەکی خێردار لە پێناو لەناوبردنی خراپەیەك. چونکە فەرموودەی پیرۆز فەرمانمان پێدەکات گەر هەر جۆرە خراپەیەکمان بینی لە پێشدا بە دەست هەوڵی لابردن و گۆڕینی بدەین، گەر نەکرا بە زمان دەبێت ئەو کارە بکەین و گەر ئەوەشمان نەتوانی دەبێت بە دڵ پێمان

---

1. البخاري، الأستقراض ١٢، الحوالة ١، ٢؛ الموطأ، البيوع ٨٤؛ أبو داود، البيوع ١٠؛ الترمذي، البيوع ٦٨؛ النسائي، البيوع ١٠١.

ناخۆش بێت.[1] بۆیە کاتێك نەنگیەك یان تاوانێك دێتە ئاراوە کە مەترسی بۆ سەر تاکێك یان کۆمەڵگە بە گشتی هەبێت، پێویستە هۆشداری بە لایەنی پەیوەندیدار و بەرپرس بدرێت تا ڕێ لەو خراپەیە بگیرێت.

نموونەکانی نێو مێژووی ئیسلام وادەکەن باشتر لە بابەتەکە حاڵی ببین:

موسوڵمانان بۆ غەزای "بەنی موستەلیق" لە سەفەردا بوون. نەبوونی و نارەحەتییەکی ئێجگار زۆر ڕووی تێکرد بوون. لە زەمینەیەکی وادا عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کە لە نێو سەربازەکاندا بوو، بەوانەی چواردەوری وت:

"هیچ شتێك مەدەن بەوانەی لە چواردەوری پێغەمبەری خوادان، تا بەجێی بهێنن. گەر بگەڕێینەوە بۆ مەدینە، بێگومان ئەوکات بێهێزەکان لەلایەن بەهێزەکانەوە وەدەردەنرێن."

لەسەر ئەمە زەیدی کوڕی ئەرقەم (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) ڕۆیشت ئەم قسەیەی گەیاندە پێغەمبەری خوا. سەرداریشمان دەستبەجێ کەسێکی نارد و داوای کرد لێکۆڵینەوە لە بابەتەکە بکرێت. عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی، سوێندی خوارد کە شتی وای نەوتووە. کاتێك ئەو ئەم سوێندە بەهێزانەی دەخوارد، چاوەکان چوونە سەر حەزرەتی زەید و هەندێك کەوتنە بیری ئەوەی کە حەزرەتی زەید ڕاستی نەوتبێت. لەسەر ئەم پێشهاتانە خوای تەعالا، سورەتی "المنافقون"ی دابەزاند کە ڕاستگۆیی حەزرەتی زەیدی پشتڕاست دەکردەوە.[2]

---

١. مسلم، الإيمان ٧٨، أبو داود، الصلاة ٢٣٢.

٢. البخاري، تفسير السورة (٦٣)، ١؛ مسلم، صفات المنافقين ١.

ناخۆش بێت.[1] بۆیە کاتێك ئەنگیەك یان تاوانێك دێتە ئاراوە کە مەترسی بۆ سەر تاکێك یان کۆمەڵگە بە گشتی هەبێت، پێویستە هۆشداری بە لایەنی پەیوەندیدار و بەرپرس بدرێت تا رێ لەو خراپەیە بگیرێت.

نموونەکانی نێو مێژووی ئیسلام وادەکەن باشتر لە بابەتەکە حاڵی ببین:

موسوڵمانان بۆ غەزای "بەنی موستەلیق" لە سەفەردا بوون. ئەبوونی و نارەحەتییەکی ئێجگار زۆر رووی تێکرد بوون. لە زەمینەیەکی وادا عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کە لە نێو سەربازەکاندا بوو، بەوانەی چواردەوری وت:

"هیچ شتێك مەدەن بەوانەی لە چواردەوری پێغەمبەری خوادان، تا بەجێی بهێنن. گەر بگەڕێینەوە بۆ مەدینە، بێگومان ئەوکات بێهێزەکان لەلایەن بەهێزەکانەوە وەدەردەنرێن."

لەسەر ئەمە زەیدی کوڕی ئەرقەم (رضيَ اللهُ عَنْهُ) ڕۆیشت ئەم قسەیەی گەیاندە پێغەمبەری خوا. سەرداریشمان دەستبەجێ کەسێکی نارد و داوای کرد لێکۆڵینەوە لە بابەتەکە بکرێت. عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی، سوێندی خوارد کە شتی وای نەوتووە. کاتێك ئەو ئەم سوێندە بەهێزانەی دەخوارد، چاوەکان چوونە سەر حەزرەتی زەید و هەندێك کەوتنە بیری ئەوەی کە حەزرەتی زەید ڕاستی نەوتبێت. لەسەر ئەم پێشهاتانە خوای تەعالا، سورەتی "المنافقون"ی دابەزاند کە ڕاستگۆیی حەزرەتی زەیدی پشتڕاست دەکردەوە.[2]

---

١. مسلم، الإيمان ٧٨، أبو داود، الصلاة ٢٣٢.

٢. البخاري، تفسير السورة (٦٣)، ١؛ مسلم، صفات المنافقين ١.

لەم ڕووداوەوە تێدەگەین کە غەیبەت نییە کاتێک قسە و پیلانگێڕییەکانی سەرۆکی دووڕووان لە دژی موسوڵمانان دەگەیەنرێتە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ). بۆیە پێغەمبەری خوا حەزرەتی زەیدی لەبەر ئەم کارە ئاگادار نەکردەوە. تەنانەت بانگی کرد و بە دەستە موبارەکەکانی بە نەرمی دەستی بە گوێیەکانیدا هێنا و نەرمووی "خوای گەورە گوێچکەی تۆی پشتڕاست کردەوە". بۆیە لە پاشاندا ئەو هاوەڵانەی ڕاستی بابەتەکەیان زانیبوو بە حەزرەتی زەیدیان دەوت "ئەو کەسەی خوای گەورە گوێیەکانی پشتڕاست کردەوە" و بەو جۆرە باسیان دەکرد.

نموونەیەکی تری ئەم بابەتە ڕووداوێکە کە بەسەر حەزرەتی عومەردا هاتووە. ڕۆژێکیان حەزرەتی عومەر بەلای حەزرەتی عوسماندا تێپەڕی[1] و سەلامی کرد، بەڵام ئەو وەڵامی نەدایەوە. لەسەر ئەمە حەزرەتی عومەر چووە لای حەزرەتی ئەبوبەکر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) و بابەتەکەی لای ئەو باس کرد. ئەویش بۆ ڕوونبوونەوەی مەسەلەکە چووە لای حەزرەتی عوسمان. لێرەدا حەزرەتی ئەبوبەکر نارەزاییەکەی حەزرەتی عومەری بە غەیبەت هەژمار نەکرد، گوێی بۆ گرت و بە دواداچوونی بۆ بابەتەکە کرد.[2]

دیسان کاتێک هەواڵی موبتەلابوونی ئەبو جەندەل بە مەی خواردنەوە لە شامەوە گەیشتە حەزرەتی عومەر، نامەیەکی بۆ خۆی نووسی. لە نامەکەدا ئایەتەکانی سەرەتای سورەتی "غافر" نووسرابوو:

---

١. دەڵێن کە ئەم هاوەڵە حەزرەتی "تەلحە" بووە.

٢. غزالي، إحياء علوم الدين ١٥٢/٣.

﴿حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴿٢﴾ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوۡبِ شَدِيدِ ٱلۡعِقَابِ ذِي ٱلطَّوۡلِۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ إِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ﴾

(غافر: ١-٣)

"بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. حا، میم. سروشکردن و بەش بەش ناردنی ئەم کتێبە لەلایەن خواوەیە (کە خاوەن قودرەتی رەهایە و زانایە بە هەموو شتێك بە باشترین شێوە). ئەو، لە هەمان کاتدا لە گوناهەکان خۆش دەبێت، تەوبەکان قەبووڵ دەکات، بەڵام سزادانیشی بە ئازار و لوتف و چاکەشی ئێجگار فراوانە. بێجگە لەو خوایەکی دی نییە. گەڕانەوە تەنها بۆ لای ئەوە."

ئەبو جەندەل نامەکەی لە نێو قوڵپی گریاندا خوێندەوە، لە هەڵەکەی خۆی تێگەیشت و دەستبەجێ تەوبەی کرد. لەم ڕووداوەدا حەزرەتی عومەر هیچ وشەیەکی نەرێنی بەو کەسە نەوت کە هەواڵی ئەم دۆخەی ئەبو جەندەلی بۆ هێنا. چونکە ئەو کەسە بە نیەتێکی سافەوە هەواڵی دۆخەکەی بە حەزرەتی عومەر دا و حەزرەتی عومەریش کێشەکەی چارەسەر کرد.

## ڕا وەرگرتن لە کەسی پەیوەندیدار دەربارەی بابەتێکی ئاینی

گەر کەسێك بچێتە لای موفتی و بپرسێ "فلانە کەس بەم جۆرە زوڵمی لێکردم، چۆن دەتوانم لەم ناڕەحەتییە ڕزگارم بێت؟"، بە غەیبەت هەژمار ناکرێت. بەڵام زاناکان دەڵێن گونجاوترە لەم دۆخە



Scanned by TapScanner

و هاوشێوەکانیدا بە بێ ناوهێنان پرسیار دەربارەی کەسە سێهەمەکان بکرێت.

لە سەدەی بەختەوەریدا ڕووداوێکی لەم جۆرە ڕوویداوە. هیندی کچی عوتبەی خێزانی ئەبو سوفیان تا پاش فەتحی مەککە پێکەوە لەگەڵ مێردەکەیدا لەنێو ئەو بەرەیەدا بوو کە دژ بە ئیسلام کاریان دەکرد، پاس فەتح بە ماوەیەکی کەم لەگەڵ پۆلێك ئافرەتدا چوو بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا و بەیعەتی پێدا و موسوڵمان بوو. ڕۆژێکیان هیند هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تا هەم سکاڵا لە مێردەکەی بکات و هەم دەربارەی بابەتێك داوای فەتوا لە پێغەمبەری خوا بکات.

هیند بەم جۆرە پرسی "ئەبو سوفیانی مێردم کەسێکی پیسکەیە. هێندە پارەمان ناداتێ بەشی خۆم و کوڕەکەم بکات. ئەمەش سەختە بۆمان. ئایا دەگونجێت من بێ ئاگاداریی خۆی پارەی ئەو ببەم؟"

پێغەمبەرمان بەم جۆرە وەڵامی دایەوە "دەکرێت بە پێوەرێکی گونجاو، بڕی پێوست بە خۆت و منداڵەکەت ببەیت".[1]

پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لە بەرامبەر ئەم بە "پیسکە" ناوبردنەیدا هیچی نەفەرمووە و ئاگاداری نەکردووەتەوە. ئەمەش بۆمان دەردەخات کە دەربڕینی خوو و تایبەتمەندییە دیاریکراوەکانی مرۆڤەکان لە کاتی پرسی فەتوادا نابێتە غەیبەت.[2]

---

١. البخاري، البيوع، النفقة ٤، كتاب مناقب الأنصار ٢٣.

٢. غزالي، إحياء العلوم الدين ١٥٢/٣.

## هەواڵدان بە مەبەستی پاراستنی کەسانی دی لە ئەگەری زیان و خراپە

مامۆستا بەدیعوززەمان نموونەی ئەوەمان بۆ دەهێنێتەوە گەر کەسێك ویستی لەگەڵ کەسێکی تردا هەماهەنگییەك ئەنجام بدات و، بیەوێت لەم بارەیەوە ڕاوێژ بە تۆ بکات. تۆش بۆ بەرژەوەندی خۆی و بێ هیچ مەبەستێك بۆ ئەوەی مافی ڕاوێژەکە بدەیت بڵێیت "هەماهەنگی لەگەڵ ئەودا ئەنجام مەدە. چونکە زەرەرمەند دەبیت"، بەم جۆرە پێدانی زانیاری بە کەسی پەیوەندیدار بۆ پاراستنی کەسانی تر لەو خراپە و زیانانەی دەیزانین، غەیبەت نابێت. چونکە دەبێت ئیماندار بە پێی پێویست براکەی ئاگادار بکاتەوە و ئەوەی یاد بخاتەوە کە ئەنجامی ئەو ڕێیەی لەسەری دەڕوات باش نییە.

گەر لەسەر چەند نموونەیەکی دیار بڕۆین دەتوانین بڵێین: بۆ نموونە گەر هاوڕێیەك یان دۆستێکمان هەبوو کە لەسەر ڕاستەڕێ بوو و بیر و هۆشی پاراو بوو، غەیبەت نییە گەر هۆشداری بدەینێ تا هاوڕێیەتی ئەو کەسە نەکات کە دەزانین بە فیکرە خراپەکانی بیر و هۆشی پاراوی مرۆڤەکان پیس دەکات. چونکە پێغەمبەری خوا لەم بابەتەدا ئاگادارمان دەکاتەوە و دەفەرموێت "مرۆڤ لەسەر ئاینی هاوڕێکەیەتی. بۆیە بزانن هاوڕێیەتی کێ دەکەن!".[1] پێویستە گوڵبژێری ئەو کەسانە بکەین کە هاوڕێیەتیان لەگەڵ دروست دەکەین و کۆڕیان لەگەڵ دەگرین. بەڵام دەبێت لەکاتی ئاگادارکردنەوەی مرۆڤەکاندا تەماشایەکی دڵمان بکەین،

١. أبو داود، الأدب ١٦؛ الترمذي، الزهد ٤٥.



Scanned by TapScanner

ئایا ئەم ئاگادارکردنەوانە لە دڵ و ناخەوەیە، یان لەبەر هەستی ئیرەییە. دیارە کە گوناهێکی گەورەیە گەر بێ هەبوونی هیچ هۆکارێکی دوودڵی یاخود زیانێکی زانراو، بچین ئەم جۆرە هۆشدارییانە لەسەر کەسی سێهەم بدەین و ببینە مایەی دروستکردنی بەد گومانی.

نموونەیەکی تر، گەر هاتوو کڕیارێك خوازیاری کڕینی کاڵایەك بوو و ئێمەش دەمانزانی کە ئەو کاڵایە کەموکوڕی هەیە. لەم دۆخەدا ڕێگرێك نییە لەبەردەم هۆشداریدان بەو کڕیارە. بەڵام دەبێت کاتێك ئەمە دەکەین، بێ مەبەست قسە بکەین و تانە و تەشەری زیادە نەدەین.

دیسان ڕەنگە کەسێك پرس و ڕاوێژمان پێ بکات دەربارەی پیاوێك یان خانمێك کە دەیەوێت هاوسەرگیری لەگەڵدا بکات، لەم جۆرە دۆخانەشدا پێویستە بە شێوەیەکی بابەتیانە هەر ڕاستیەک دەزانین سەبارەت بەو کەسە بێ هیچ نیازێکت لاوەکی بیگەیەنین بەو کەسەی پرسی پێ کردووین. گەر وەڵامەکەمان دەربارەی ئەو کەسە نەرێنی بوو، پێویستە هەوڵ بدەین لە سەرەتادا داخراوانە بدوێین، هەستی ئەوەی پێ بدەین کە ڕای ئێمە لەو بارەیەوە ئەرێنی نییە. بەڵام گەر ئەو کەسەی ڕامان وەردەگرێت، بیەوێت بزانێت ئەم هەڵوێستەی ئێمە لە چییەوە سەرچاوە دەگرێت، ڕەنگە بکرێت لەم بارەدا بچینە نێو وردەکارییەکانەوە. لەگەڵ ئەمەدا لە بری ئەوەی یەکەم هەڵوێستمان ژماردنی یەکە یەکەی هەڵە و کەموکوڕییەکانی بێت، پێویستە ڕای خۆمان بە شێوازێکی گشتی و داخراوانەتر بگەیەنین.

خانمی هاوەڵ، فاتمەی کچی قەیس دەچێتە لای پێغەمبەری ئازیز و دەیەوێت ڕای وەربگرێت دەربارەی دوو کەس کە خوازیارن هاوسەرگیریی لەگەڵدا بکەن، یەکێك لەوانە معاویە و ئەوی تریان ئەبولجەهم بوو. پێغەمبەری خوا بۆ یەکەمیان فەرمووی "هەژارە و دارایی نییە" و بۆ دووەمیشیان وتی "کەسێکە زۆر لە ئافرەت دەدات"، پاشان داوای لە حەزرەتی فاتمە کرد هاوسەرگیری لەگەڵ ئوسامەی کوڕی زەیددا بکات.[1] ئەمەش نیشانی دەدات کە غەیبەت نییە گەر ئەو کەسەی پێش دروستکردنی خێزان پرس و ڕای پێ دەکرێت، بێ مەبەستی خراپکردنی کەسی سێهەم ئەوەی دەیزانێت بیڵێت. بگرە بە پێچەوانەوە، لەم جۆرە دۆخانەدا پێدانی زانیاریی نادروست و شاردنەوەی ڕاستی حەرامە.

کاتێك لەم ڕووداوەدا پێغەمبەرمان (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) دەربارەی معاویە دەفەرموێت "هەژارە و دارایی نییە"، نابێت وا تێبگەین کە هاوسەرگیری لەگەڵ هەژاراندا نەشیاوە. سەروەرمان بەم فەرمایشتەی ئەوەی خستووەتە بەرچاو کە بەپێی عورف، ئەو پیاوەی هاوسەرگیری دەکات دەبێت خاوەنی داهاتێکی وا بێت بتوانێت نەفەقە (خەرجی)ی خێزانەکەی دابین بکات و دەریدەخات کە ئەمە لە ڕوانگەی ئاسوودەیی خێزانییەوە خاڵێکی گرنگە.

پێغەمبەرمان وەك بەربەستێکی بەردەم هاوسەرگیری تەماشای ئەو

---

1. لەسەرەتادا فاتمە (رضيَ اللهُ عنها) نەیدەویست هاوسەرگیری لەگەڵ حەزرەتی ئوسامەدا (رضيَ اللهُ عنه) بکات، بەڵام بە هۆی پێداگری پێغەمبەر (صلّى اللهُ عليهِ وسلّمَ) ڕازی بوو. دواتر بۆخۆی باسی ئەوەی دەکرد کە بەهۆی ئەم هاوسەرگیرییەوە زۆر دڵ خۆش بووە و بە ستایشەوە باسی جوامێریی هاوسەرەکەی دەکرد.

تایبەتمەندییەی ئەبولجەحم دەکات کە لێدانی ئافرەتانە و وەك خاڵێکی گرنگ سەرنجمانی بۆ ڕادەکێشێت.

دەبینین باسکردنی ئەم تایبەتمەندییانەی ئەو دوو کەسە بە غەیبەت هەژمار نەکراوە، بەم جۆرە، ئەوەی پێویست بوو لە پێش هاوسەرگیریدا بوترێت وەبیر هێنرایەوە و باس کرا.

لە لایەکی دیکەوە پێویستە ئەوانەی وەك گەواهیدەر (شایەت) بۆ دادگا بانگ دەکرێن، وەڵامی بێلایەنانەی پرسیارەکان بدەنەوە. چونکە خاتری حەق گەلێ بەرزە، نابێت بکرێتە فیدای هیچ خاترێك. بۆیە غەیبەت نییە گەر دوور لە سووکایەتی و ناوزڕاندن و تانە و قسەی نەشیاو کاتێك پێویست دەکات گەواهی بدەین، ڕاستی ئەو شتانە بڵێین کە دەربارەی ئەو کەسە دەیزانین.

## قسەکردن دەربارەی گوناهی ئەوانەی بە ئاشکرا گوناه دەکەن

حەزرەتی بەدیعوززەمان لەو ڕستانەیدا کە دەرخەری ئەم دۆخەیە دەڵێت "ئەو پیاوەی غەیبەت دەکرێت گوناهکاری ئاشکرایە. واتە بێزار نابێت لە خراپە، ڕەنگە شانازیش بکات بەو خراپانەی ئەنجامیان دەدات؛ چێژ لە زوڵمەکەی وەردەگرێت، بە ئاشکرا و بێ وچان ئەنجامی دەدات".

یەکێك لە ناوە جوانەکانی خوای گەورە "الستّار"ە. واتە ئەو کەسەی گوناهی بەندەکانی ناداتەوە بە دەموچاویاندا و، مۆڵەتیان دەداتێ و

دەرفەتی ئەوەیان پێدەدات هەڵەکانیان داپۆشن. پێویستە بەندە گوناه و پەشیمانییەکەی لە ناخیدا هەڵبگرێت، بۆ خەڵکی ئاشکرا نەکات و پەنا بۆ ڕەحمەتی فراوانی خوای خۆی بەرێت. لە دوعاکانیدا بڵێت "خوایە گیان! پێم خلیسکا، زمانم شلەژا. چۆن هەڵەیەکی وام کرد. تۆ ئەم هەموو نیعمەتەت بە من بەخشی کەچی من لە ڕێی تۆ لام دا. بمبەخشە! بمبەخشە تا سبەی بە هەڵەکانمەوە شەرمەزار نەبم لە دەرگانەی تۆدا. لە ڕۆژی مەحشەردا ئەم گوناهە شاراوانەم مەدە بە چاودا و ریسواو ڕوو زەردم مەکە!" دەبێت وا بڵێین و هەستی پۆزش و پەژارەمان نیشان بدەین. لەبەر ئەمەیە پێغەمبەرمان (صَلَوَاتُ اللّٰهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) داوای لێکردووین بەپێی ناوی سەتتاری خوای گەورە هەڵسوکەوت بکەین و دەفەرموێت "ئەو کەسەی کەموکوڕی موسوڵمانێك داپۆشێت، خوای گەورەش لە ڕۆژی قیامەتدا کەموکوڕی ئەو دادەپۆشێت و دەیشارێتەوە."[1]

مامۆستا محمد فەتحوڵڵا گولەنیش دەربارەی بابەتەکە دەڵێت "دەمەوێت بچووکترین کینم بەرامبەر هیچ یەکێك لە ئەهلی ئیمان نەبێت. هەردەم لایەنە باشەکانیان ببینم. گەر بینیم یەکێك لە براکانم گەورەترین گوناهیشی ئەنجام داوە، دایدەپۆشم، وەك ئەوەی نەمدیبێت."[2]

ئەو بەندایەتییەی ئیسلام فێری کردووین بەو جۆرەیە، بەڵام هەندێك "بێ شەرم" بە ڕۆژی ڕوون لە نێو خەڵکدا و لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان یان لەسەر پەڕی ڕۆژنامەکان بە وردی باسی ئەو

---

١. البخاري، مظالم ٣؛ مسلم، بر ٥٨.

٢. م.فەتحوڵڵا گولەن، لە بەشێکەوە بۆ بەشێکی تر.

گوناهە دەکەن کە شەو ئەنجامیان داوە و دەیانەوێت وەك شتێکی ئاسایی خراپەکارییەکانی خۆیان بەناو کۆمەڵگەدا بڵاو بکەنەوە. پێغەمبەری خوا باس لە مەحرووم بوونی ئەم کەسانە لە ڕەحمەتی خوا دەکات و دەفەرموێت "بێجگە لەوانەی گوناهەکانیان ئاشکرا دەکەن، هەموو ئوممەتەکەم بەر لێخۆشبوون دەکەوێت. ئاشکراکردنی گوناه واتە کاتێك کەسێك شەو کارێکی خراپ ئەنجام دەدات و لە کاتێکدا خوا ئەو خراپەیەی داپۆشیوە، ئەم هەڵدەستێت و دەڵێت "ئەی فلان، دوێنێ شەو من ئاوا و ئاوام کرد". واتە سەرەڕای خراپەکارییەکەی، کە خوای گەورە داپۆشیوە و شەوی بەسەردا هێناوە، ئەم لە بەیانیدا ئەوە ئاشکرا دەکات کە خوا داپۆشیوە".[1]

وەك لە فەرموودە پیرۆزەکەدا هاتووە، ڕەفتارێکی ئاسایی نییە مرۆڤ گوناهەکەی لەگەڵ خەڵکیدا بەش بکات و ئاشکرای بکات. ئەوەی گوناه دەکات پێویستە بێدەنگ بێت. گەر بێدەنگ نەبێت و لەملاولا باسی ئەو کردەوە خراپانەی بکات کە ئەنجامی داون، دەبێت پەنا بە خوا بگرین لە خراپەی ئەم جۆرە کەسانە و ئیماندارانیش ئاگادار بکەینەوە تا پارێزراوبن لە خراپەیان و بڵێین "بترسە لەوانەی لە خوا ناترسن" بۆ ئەوەی دووربن لەوانەی شەرمیان بەرامبەر خوا نەماوە. یەکێك لەو وتانەی دەدرێنە پاڵ پێغەمبەری ئازیز دەوترێت "غەیبەتی ئەو کەسەی پەردەی شەرمی لەسەر خۆی لابردووە، غەیبەت نییە"[2]،

---

١. البخاري، الأدب ٦٠؛ مسلم، الزهد ٥٢.

٢. بيهقي، سنن الكبرى ١٠/٢١٠؛ القضاعي، مسند الشهاب ١/٢٦٣.

لە یەکێکی دیدا "ڕێز و حورمەت مەنوێنن بەرامبەر ئەوەی بە ئاشکرا گوناھ دەکات! خراپەکانی باس بکەن تاوەکو مرۆڤەکان خۆیانی لێ بەدوور بگرن."[1] بەم جۆرە ئاماژە بەوە کراوە کە غەیبەت نییە گەر قسە لەسەر گوناھی کەسێك بکرێت کە خۆی ئاشکرای دەکات.

بە گوێرەی ڕیوایەتێکی حەزرەتی عائیشە (رضي الله عنها)، جارێکیان کەسێك ویستی بێتە خزمەت پێغەمبەرمان، ئەویش فەرمووی "پیاوخراپی نێو هۆزەکەیەتی بەڵام دەرفەتی بدەن با بێت"[2]، کاتێکیش پیاوەکە هاتە خزمەتی بە نەرمی مامەڵەی لەگەڵدا کرد و بە شادومانی ناردییەوە. دایکمان چاودێری پێشهاتەکانی دەکرد و حیکمەتی ئەم ڕووداوەی لە پێغەمبەری ئازیز پرسی، ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی "ئەی عائیشە! ئەو کەسەی ڕۆژی قیامەت لە بەرامبەر خوای گەورەدا لە خراپترین حاڵدایە، ئەوەیە کە مرۆڤەکان لەبەر خراپکارییەکانی خۆیانی لێ بەدوور دەگرن"

بەم جۆرە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بۆ خۆپاراستن لە خراپەی ئەو کەسەی سەردانی کردبوو، بە شێوازێکی گونجاو مامەڵەی کرد. چونکە گەر پێغەمبەرمان بەو جۆرە مامەڵەی لەگەڵ کردبا کە لە ئامادەنەبوونیدا دەربارەی فەرمووی، مەترسی ئەوە هەبوو ئەو کەسە بە تەواوی لە پێغەمبەرمان دوورکەوتبایەوە. بێگومان پێغەمبەری خوا نەیدەویست ببێتە مایەی شتێکی وەها.

---

١- الجامع الصغير ١/٣٥٧

وەك دەبینین ئازیزمان ویستویەتی ئیمانداران لەو کەسانە ئاگادار بکاتەوە کە بە ئاشکرا خراپکاری دەنوێنن. گەر ئاکارێکی وەها غەیبەت بووایە هەرگیز بە بیردا نەدەهات ئەو بە وەها کارێك هەستێت.

دیسان بە پێی گێڕانەوەکانی حەزرەتی عائیشەی دایکمان، جارێکیان پێغەمبەری ئازیز دەربارەی دوو کەس کە قسە لەسەر نیفاقیان دەکرا فەرمووی "پێم وا نییە فلان کەس و فلان کەس شتێك لە ئاینەکەمان بزانن"[1] بەم جۆرە هەستی بە پێویستی ڕوونکردنەوەی حاڵی ئەو دووانە کردووە تا مرۆڤەکان بە ڕوانینیان بۆ حاڵی ئەوان نەکەونە هەڵەوە.

حەزرەتی عومەریش ئاماژەی بەوە کردووە کە ئەوەی بە ئاشکرا گوناه دەکات شایەنی ڕێز نییە و دەکرێت باسی بکرێت. لەبەر ئەمەیە کە زانایانی ئیسلام غەیبەتی دەسەڵاتدارە زاڵمەکان و ئەو بیدعەتچییانەی شتانی نوێی نەگونجاو لەگەڵ ڕۆحی ئاین دێننە ئاراوە و ئەوانەی بە ئاشکرا گوناه ئەنجام دەدەن، بە ڕێپێدراو لەقەڵەم دەدەن.[2]

لێرەدا دەبێت شتێك بەبیر بهێنینەوە. مۆڵەتی غەیبەتکردنی ئەم جۆرە کەسانەش شتێکی موتڵەق نییە. نابێت واتایەکی وا لەمە دەربکەین کە گوایە بتوانین لە قسەکانماندا هەموو شتێکی ئەوان باس بکەین و لە هەموو بابەتێکدا غەیبەتیان بکەین. ئەو خاڵەی مۆڵەت دراوە غەیبەتیانی تێدا بکرێت تەنها ئەو گوناه و هەڵانەیە کە بە ئاشکرا ئەنجامیان دەدەن. باسکردنی بابەتەکانی غەیری ئەمە دروست نییە.

١. البخاري، الأدب ٥٩.

٢. غزالي، إحياء علوم الدين ١٥٣/٣.

جارێکیان عەوفی کوڕی جەمیل دەچێتە خزمەت ئیبن سیرین کە یەکێکە لە کەڵە پیاوانی نەوەی تابیعین. دەستدەکات بە باسکردنی حەجاج. هەڵوێستی ئیبن سیرین بەم جۆرە دەبێت بەرامبەری "بێگومان پەروەردگار دادوەرانە فەرمانڕەوایی دەکات. کە ڕۆژی هات، وەک چۆن سزای ئەو کەسە دەدات کە غەیبەتی حەجاجی کردووە، حەجاجیش لەبەر ستەم و زوڵمەکەی بە سزای خۆی دەگەیەنێت. سبەی کاتێک چوویتە دیداری خوای گەورەوە، بچوکترین گوناهت لە گەورەترین گوناهی حەجاج قورستر دەبێت لەسەرت."[1]

## بەکارهێنانی ئەو دەستەواژانەی مەبەستی ناساندنیان تێدایە

هەندێک لە مرۆڤەکان لە بری ناوەکانی خۆیان بە هۆی هەر ناتەواوییەکەوە کە هەیانە، بە ناسناو گەلێکی نەشیاوی وەک "سالمە بێ قۆڵ" و "عوسمانە شەل" ناودەبرێن و بەو جۆرە دەناسرێن. دەبینین زانایانی ئیسلام لە گێڕانەوەکانیاندا عەبدولڕەحمانی کوڕی هورموزیان بە "أعرج"[2] ناوبردووە و سولەیمانی کوڕی میهرانیشیان بە "أعمش"[3] ناو بردووە و ئەمەشیان بە غەیبەت هەژمار نەکردووە. چونکە ئەو کەسانە قەبووڵیان بووە بەو جۆرە ناو ببرێن و لەمە ناڕەحەت نەبوون. ئەوەی

١. غزالي، إحياء علوم الدين ١٥٣/٣.

٢. شەل.

٣. کەسێک باش نابینێت

جارێکیان عەوفی کوڕی جەمیل دەچێتە خزمەت ئیبن سیرین کە یەکێکە لە کەڵە پیاوانی نەوەی تابیعین. دەستدەکات بە باسکردنی حەجاج، هەڵوێستی ئیبن سیرین بەم جۆرە دەبێت بەرامبەری "بێگومان پەروەردگار دادوەرانە فەرمانڕەوایی دەکات. کە ڕۆژی هات، وەک چۆن سزای ئەو کەسە دەدات کە غەیبەتی حەجاجی کردووە، حەجاجیش لەبەر ستەم و زوڵمەکەی بە سزای خۆی دەگەیەنێت. سبەی کاتێک چوویتە دیداری خوای گەورەوە، بچوکترین گوناهت لە گەورەترین گوناهی حەجاج قورستر دەبێت لەسەرت."[1]

## بەکارهێنانی ئەو دەستەواژانەی مەبەستی ناساندنیان تێدایە

هەندێك لە مرۆڤەکان لە بری ناوەکانی خۆیان بە هۆی هەر ناتەواوییەکەوە کە هەیانە، بە ناسناو گەلێکی نەشیاوی وەك "سالمە بێ قۆڵ" و "عوسمانە شەل" ناودەبرێن و بەو جۆرە دەناسرێن. دەبینین زانایانی ئیسلام لە گێڕانەوەکانیاندا عەبدولڕەحمانی کوڕی هورموزیان بە "أعرج"[2] ناوبردووە و سولەیمانی کوڕی میهرانیشیان بە "أعمش"[3] ناو بردووە و ئەمەشیان بە غەیبەت هەژمار نەکردووە. چونکە ئەو کەسانە قەبووڵیان بووە بەو جۆرە ناو ببرێن و لەمە ناڕەحەت نەبوون. ئەوەی

١. غزالي، إحياء علوم الدين ٣/١٥٣.

٢. شەل.

٣. کەسێك باش نابینێت

گرنگە ئەوەیە کە ئەم نازناوانە بە مەبەستی ناساندن بەکاربهێرێن نەك سوکایەتی. بەڵام گەر کرا و دەستەواژەی خۆشتر هەبوو بۆ بانگ کردن، ئەوا باشترە نازناوەکە بەکار نەهێنین.

دەرگای غەیبەت لەم بابەتانەدا کەمێك والآیە و بێ مەبەست و تەنها بۆ دەستنیشانکردنی ڕاستی و بۆ پێویستییەك بەو شێوانەی شیمانکردەوە، دەکرێت باسکردنی مرۆڤەکان ڕێپێدراو بێت. غەیبەت کردن لە دەرەوەی ئەمانە وەك چۆن ئاگر دار دەسووتێنێت و تەواوی دەکات، ئاوا کردەوە باشەکانی مرۆڤ دەخوات و دەیبات.

# هۆكارە هاندەرەكانی غەیبەت و چۆنێتی خۆپاراستن لێیان



کەی ئەمە خوی مرۆڤ بوو،
بێ پەروا خواردنی لاکی مرۆڤ!"
محمد عاکیف ئێرسۆی

بێگومان هۆكاری جۆراوجۆر هەن كە هانی غەیبەت كردن دەدەن. دەتوانین لە ژێر ئەم ناونیشانانەی خوارەوەدا پۆلێنیان بكەین:

## هەستی تووڕەیی و نەفرەت:

كاتێك كەسێك بە هەر هۆكارێك بێت، ڕقی لە كەسێكی دی هەڵدەستێت، لە پشتییەوە غەیبەتیشی دەكات. چونكە گرنگترین هۆكاری پاڵنەری غەیبەت تووڕەیی و نەفرەتە. ئەو كەسە لە ڕێگەی غەیبەت كردن و بە خراپ باسكردنی ئەوەی لێی تووڕەیە، هەوڵ دەدات هێور ببێتەوە و ئاسوودە بێت. جا گەر ئەم كینە كەم ماوەییە جێی خۆی بگرێت و

ڕەگ دابکوتێت، بە تێپەڕینی کات دەگۆڕێت بۆ هەستێکی بەهێزی ڕق و نەفرەت و ئیدی ئەو کەسە لە هەموو دەرفەتێکدا دەکەوێتە غەیبەت کردنی مرۆڤی مەبەست.

لە ڕاستیدا گەر هەستی تووڕەیی بە خراپی بەکار نەهێنرێت، هێزێکی پاڵنەر و قەڵغانێکی پتەوە کە لە پەلامارە دەرەکییەکان دەمانپارێزێت. لەبەر ڕۆشنایی ئەم دانابییەدا جەنابی اللّٰه هەستی تووڕەیی وەك سپاردەیەك بە مرۆڤە بەخشیوە. مرۆڤ بە هۆی ئەم هەستەوە لەو شوێنانەی پێویستە موجاهەدە بکات، مافی هێز و توانا دەدات و هەر بە پاڵنەرایەتیی ئەم هەستە شەرەف و ناموس و نیشتیمان و گیان و ماڵ و نەفس و نەوەی دەپارێزێت و خاوەندارێتی لێ دەکات.

کاتێك هەستی تووڕەیی لە جێی خۆیدا بەکاردێت، هەستێکی تا بڵێیت شیاوە. بەڵام کاتێکیش بە واتا نەرێنییەکەی بەکار دەهێنرێت، دەبێتە یەك لە لاوازترین دەمارەکانی ئەو مرۆڤە. لە ڕاستیدا ئەو مرۆڤانەی کە دەتوانن بێڕێزییەکان لە نێو فراوانیی ویژدانیاندا بتوێننەوە و بە ئاسانی هاوسەنگیی تورەییان ڕابگرن و لە کاتی ئەنجامدانی ئەمانەشدا لەسەر ئیستیقامەت بمێننەوە، ژمارەیان تا بڵێیت کەمە. لەبەر ئەمەیە باپیرانمان وتوویانە "کە تورەیی هات، عەقڵ دەڕوات". بۆ ئەوەی لەم بابەتەدا سەرکەوتووبین، دەبێت ئیرادەیەکی بەهێزمان هەبێت و لەم بابەتەدا خاوەنی هەوڵ و تێکۆشانی تایبەتی بین. بە هەمان شێوە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) گوزارشت لەم ڕاستییە دەکات و دەفەرموێت "بەهێز ئەو پاڵەوانە نییە کە لە زۆراندا ڕکابەرەکەی ژێر دەخات و

خۆی نابەزێت، بەهێزی ڕاستەقینە ئەو مرۆڤەیە کە لە کاتی توورەییدا نەفسی خۆی دەبەزێنێت و بەسەر خۆیدا زاڵ دەبێت"[1]، ئاماژەشی بەوە کردووە کە ئەمە کارێکی سەختە. جارێکی تر کاتێك کەسێك هات و بە پێغەمبەری ئازیزی فەرموو "ئامۆژگاریم بکە" پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) لە وەڵامدا فەرمووی "نوقمی تورەیی مەبە، توورەیی نەتگرێت!.." ئەو کەسە چەند جارێك داوای ئامۆژگاری لە پێغەمبەری ئازیز کردەوە، سەروەری ڕاستگۆیانیش لە هەموو جارەکاندا پێی فەرموو "تووڕە مەبە"[2].

توورەیی زۆر، ئافاتی ئەقڵ و گیرۆدەیی هەستە. ئەو ڕەنگە تەنانەت ڕێکڕەفتارترین مرۆڤ بکاتە دێوانە و دڕندە. توورەیی عەقڵ و درکی مرۆڤ گێل دەکات و هەست و جۆشێکی لەدەست دەرچوو لە شوێنی دادەنێت، مرۆڤ دەخاتە ژێر هێڵی مرۆڤ بوونەوە. زۆر ئەستەمە مرۆڤ لە وەها دۆخێکدا هاوسەنگانە مامەڵە بکات و گوێ بۆ ئامۆژگاری ڕابگرێت. ئەوانەی کە دەتوانن سەرباری هەموو شتێك، جڵەوی توورەییەکەیان بکەن و هەوڵ دەدەن وەك قووتدانی دڕکێك یان پارچە کاکتۆسێك هەستی غەزەب و توورەییان قووتبدەن و توورەییان کپ بکەنەوە و جڵەوی بکەن، قورئانی پیرۆز بە پیاهەڵدان یادی کروونەتەوە و فەرموویەتی:

﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾

(آل عمران: ١٣٤)

---

١. البخاري، الأدب ١٠٢؛ مسلم، البر ١٠٦.

٢. البخاري، الأدب ٧٦؛ الترمذی، البر ٧٣؛ الموطأ، حسن الخلق ١١.

"ئەوانەی ماڵ دەبەخشن (لە ڕێ ی خوادا) لە کاتی خۆشی (دەوڵەمەندی) و ناخۆشی دا و ڕقی بەتینی خۆیان دەخۆنەوە و دەبوورن لە خەڵکی، خواش چاکەکارانی خۆش دەوێت."

بەم جۆرە پەسنیان دەکات و دەستخۆشی لەو کەسانە دەکات کە سەرەڕای هەبوونی هێز و توانای تۆڵە سەندنەوە، تۆڵە لەوانە ناسێننەوە کە زیانیان پێ گەیاندوون، بە قەڵغانی لێبووردەییەوە ڕووبەڕووی ئەوانە دەبنەوە کە خراپەیان بەرامبەر دەکەن.

جارێکیان زویرییەکی کەم کەوتە نێوان حەزرەتی سەعدی کوڕی ئەبی وەققاس و حەزرەتی خالیدەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُم)، کەسێک ئەمەی کردە دەرفەتێك و دەستی کرد بە زەم کردنی حەزرەتی خالید لەلای حەزرەتی سەعد، سەعد یەکسەر وەستاندی و فەرمووی "ئا بوەستە! ئەوەی لە نێوان من و ئەودایە نەگەیشتووەتە ئەو ئاستەی کار لە ئاینەکەمان بکات."[١]

حەزرەتی سەعد (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) دەیەوێت بڵێت "من ڕێگە نادەم غەیبەتی براکەم بکرێت. گەر کێشەش لە نێوانماندا بێت، ڕێگە نادەم قسە بەو بوترێت و ئەو گوناهە بکرێت" بەڵێ هاوەڵان بەم جۆرە و بە هیچ جۆرێك نەیاندەهێشت دەرگای گوناه واڵا ببێت.

کاتێك سوفیانی سەوری ئامۆژگاری کەسێکی دەکرد "لە غەیبەت بەدوور بە! قسەی بەرز و نزم دەربارەی مرۆڤەکان مەکە، تا ئاینەکەت لەناو نەچێت!" جەختی لەوە کردووەتەوە کە غەیبەت مەترسییەکی تا بڵێیت جددییە لەسەر ئاین و دوا ڕۆژمان.

کاتێك مرۆڤ زۆر توورە دەبێت بەڵام مافی ئیرادەی دەدات و

١. إبن أبي شيبه، مصنف ٢٣٠/٥؛ طبراني، معجم الكبير ١٠٦/٤.

دەست و زمانی لە زیان گەیاندن بە دەوروبەر دەپارێزێت، ئەم ڕەفتارەی بۆی دەبێتە "بەندایەتی مەنفی". واتە کاتێک مرۆڤ دەگاتە ئەوپەڕی تووڕەیی، گەر توانی بەسەر نەفسیدا زاڵ بێت و دواتر بە وەبیرهێنانەوەی چەند شتێک بە ئاگا بێتەوە و بۆ لەبیرچوونەوەی هۆکاری ئەو تووڕەییە ململانێ لە ناخی خۆیدا بکات و بە وتنی "خوا لە ئەو و لە منیش خۆش بێت" تووڕەییەکەی دابمرکێنێتەوە، یاخود بە هەڵگرتنی دەستنوێژ ئەو ئاگرە خامۆش بکات کە شەیتان بڵێسەی پێ سەندووە، ئەوا ئەو کەسە وەک ئەوەی ئارامی بەرامبەر نەخۆشی و لەش بەباری و بەڵا و چەرمەسەری و نەهامەتیەکان گرتبێت، خێرێکی زۆری بۆ دەنووسرێت. خوای گەورە (جَلَّ جَلَالُهُ) لە ڕۆژی قیامەتدا لە بەردەم درووستکراوانیدا بانگهێشتی ئەم مرۆڤانە دەکات و بە لوتفی زیادی خۆی پاداشتیان دەداتەوە. لە لایەکی ترەوە گرنگترین هۆکاری زاڵبوون بەسەر تووڕەییدا بریتییە لە ژیان لە نێو مەقامی ئیحساندا، ئەوەتا لە کۆتایی ئایەتە پیرۆزەکەدا باسی ئەو مرۆڤانە دەکات کە سەرەڕای هاتنەکایەی چەندین هۆکار و پاڵنەر بۆ تووڕەبوون، تووڕەییەکەیان قوتدەدەن و دان بە خۆیاندا دەگرن، وتراوە "خواش چاکەکاران (محسنین)ی خۆش دەوێت"، واتە ئاماژە کراوە بەوەی توانستی زاڵبوون بەسەر تووڕەییدا بەندە بە هەستی (ئیحسان)ەوە و بەم پێیەش ئەوانەی کە زاڵ دەبن بەسەر توڕەییەکەیاندا بە چاکەکار (محسن) دادەنرێن. لە ئینجیلدا هەواڵێکی لەم جۆرە هاتووە "ئەی نەوەی ئادەم! لە کاتی تووڕەییدا منت بەبیر بێتەوە تا منیش لە کاتی غەزەبمدا تۆم بیر بێتەوە و تۆش لەگەڵ ئەوانی تردا بە هیلاک نەبەم"[1].

---

1. غزالي، إحياء علوم الدين ١٧٣/٣، ١٤٩.

هەستی ئیحسان کە لە ئایەتە پیرۆزەکەدا باس کراوە، دوو دەرخشانەوەی هەیە. یەکەمیان؛ بریتییە لە چاکەکردن لەگەڵ ئەو کەسەدا کە خراپەی بەرامبەر ئەنجام دەدات. بە گوێرەی خووڕەوشتی ئیسلام، مەرجە بە چاکە وەڵامی خراپە بدرێتەوە و ئەم لێهاتنەش جوانییەکی تایبەتی ئارامگرانە. خوای باڵادەست ئەم ڕاستییەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە و دەفەرموێت:

﴿ وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا الَّذِينَ صَبَرُوا وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴾

(فصلت: ٣٤-٣٥)

"چاکە و خراپە نابنە یەك. کە وایە تۆ هەوڵ بدە بە باشترین شێوە خراپە دوور بخەیتەوە. کاتێك دەزانیت ئەو کەسەی دوژمنایەتیت لەگەڵیدا هەبووە، بووەتە دۆستێکی گیانی بە گیانیت! بەڵام خەسڵەتی چاکەکردن بەرامبەر خراپە تەنها دەستکەوتی ئارامگران و خاوەن ڕەوشتە بەرزەکانە".

لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا ئازیزمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێت "بەرزترین ڕەوشت؛ بریتییە لە هەواڵپرسی و نوێکردنەوەی پەیوەندی لەگەڵ ئەوانەدا کە پەیوەندی خزمایەتی و دۆستایەتییان لەگەڵدا پچڕاندوویت، تۆ چاکە لەگەڵ ئەوانەدا بکەیت کە تۆیان وەلاناوە، هەروەها بریتییە لە لێبووردن لەو کەسەی قسەی نەشیاوی پێ وتوویت و سووکایەتی پێ کردوویت"[1]

١. أحمد بن حنبل، المسند ٤٣٨/٣؛ طبراني، معجم الكبير ١٨٨/٢٠.

دەروشانەوە و واتای دووەمی ئیحسانێش بە گوێرەی پێوانەكانی حەقیقەت بریتییە لە بیركردنەوەی باش و دانانی پلانی باش و وابەستەیی شتی باش و بەجێهێنانی سەرجەم ڕەفتارەكانی سەر بە بەندایەتی، بەو هەستەوە كە لەبەردەم ڕوانینی پەروەردگاردا ئەنجام بدرێن؛ هەمیشە هەڵسوكەوت كردن وەك ئەوەی خوا ببینیت یان هیچ نەبێت مافی ئەوە بدەیت كە لەلایەن ئەوەوە دەبینرێیت. كاتێكیش لەم ڕووانگەیەوە تەماشای بابەتەكە دەكەین، دەبینین كە زاڵبوون بەسەر توورەییدا بەندە بە هەستی ئیحسانەوە، واتە بەندە بە لە ناخەوە یادكردنەوەی پەروەردگار و پەنا بۆ بردنی. هەر بۆیە پێغەمبەری ئازیزیشمان (صَلَّىٰ ٱللَّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئامۆژگاری كەسی توورەبوو دەكات كە پەنا بە خوا بگرێت لە شەیتان.[1]

یەكێك لەو چارەسەرانەی ڕابەری ئازیز بۆمان دەستنیشان دەكات بۆ كپكردنەوەی توورەیی، بریتییە لە بێدەنگ بوون.[2] چونكە شەیتان لە ڕێگەی توورەییەوە بڵێسەی ئاگرێكی هاویشتوەتە سەر دڵ و زمانی ئەو كەسە. لەم دۆخەدا بۆ ئەوەی زوو ئەو ئاگرە خامۆش بێت، پێویستە یاری پێ نەكرێت. هەتا قسە بكرێت، ئەگەری زیانگەیاندنی ئەو ئاگرە زیاتر دەكات. لە كاتی توورەییدا ڕەنگە چەندین گوفتاری ناشرین لە دەمی مرۆڤ بترازێت كە بۆ تەمەنێك لە نێو ئەشكەنجەی ویژدانیدا بیتلێنێتەوە. بۆیە بێدەنگبوون لە كاتی توورەییدا یەك لە ڕەفتارە هەرە ئاقڵانەكانە.

ڕێگایەكی تری كۆنترۆڵكردنی توورەیی بریتییە لە پەنابردن بۆ گۆڕینی سایكۆلۆژی شێواز و دۆخ. دەروونناسەكان، ئامۆژگاری

١. الترمذي، الدعوات ٥٣؛ أبو داود، الأدب ٤.

٢. أحمد بن حنبل، المسند ١/٢٣٩.

مرۆڤ دەکەن کە بۆ خۆ نوێکردنەوە و لابردنی ناڕەحەتی و بێزاری، دۆخ و شێوازی ئەو کاتەی خۆی بگۆڕێت. بۆیە پێویستە سوود لەم ئامۆژگارییەی پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) وەربگرین کە دەفەرموێت "گەر یەکێکتان لە کاتی تووڕەبووندا بە پێوە بوو، با دابنیشێت، گەر توڕەییەکەی نەما ئەوا زۆر باشە، گەر تووڕەییەکەشی هەر مابوو، با ڕابکشێت".[1]

گەر سەرەڕای هەموو شتێك سەرکەوتوو نەبوون لە زاڵبوون بەسەر تووڕەییەکەدا، ئەوا دەکرێت خۆمان بە ئاوێکی فێنك ساردبکەینەوە و دەستنوێژ بگرین. چونکە پێغەمبەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەفەرموێت "تووڕەیی لە شەیتانەوەیە، شەیتانیش لە ئاگر درووستکراوە. ئاگر تەنها بە ئاو خامۆش دەبێت. بۆیە کاتێك تووڕە دەبن، دەستنوێژ بگرن".[2] گەر ویستتان لەگەڵ ئەمەدا شتێکی سەروو ئەمەش بکەن، ئەوا بەو دەستنوێژەوە بچنە خزمەت خوای گەورە و دوو ڕکات نوێژ بکەن. لەبەر ئەوەی "دەرمانی هەموو جۆرە تووڕەیی و شەڕێکی زوبان، دوو ڕکات نوێژە".[3]

پاش ئەوەی هەموو ئەمانەمان لەپێناو کۆنترۆڵکردنی تووڕەییدا ئەنجام دا، پشت بە خوا خوای گەورە ناخمان بە ئاسوودەیی ئاوەدان دەکاتەوە و لە غەیبەت کردن دەمانپارێزێت. لە هەمان کاتدا پێویستە داوای لوتف و کەرەمی پەروەردگاری مەزن بکەین تا لەم بابەتەدا سەرکەوتوومان بکات.

---

١. أبو داود، الأدب ٤.

٢. أبو داود، الأدب ٤.

٣. المناوي، فيض القدير ٣/٢٦٦

## هەستی تۆڵەسەندنەوە

لایەنێكی تری گرنگی بابەتی غەیبەت بریتییە لەوەی هەندێك كەس وا دەزانن كاتێك كەسێك لە پاشەملە بە خراپە باسیان دەكات، ئەمانیش لەبەر ئەوەی غەیبەت كراون، مافی ئەوەیان هەیە هەمان شتیان بەرامبەر بكەن. لە كاتێكدا غەیبەت كردنیان لەلایەن كەسانێكەوە، غەیبەت كردن و باسكردنی خەڵكی بۆ ئەمان موباح (ڕێپێدراو) ناكات. لە هیچ كتێبێكدا نەهاتووە بڵێت كەسی غەیبەتكراو مافی غەیبەتكردنەوەی هەیە. گوناهەكان لە پێش هەمووشیانەوە غەیبەت، هەریەك بۆخۆیان گوناهن و هەر كەسێك ئەنجامیان بدات گوناهی دەگات، بۆیە بە هیچ شێوەیەك نابێتە بیانوویەك بۆ ئەوەی غەیبەت بەگوناه هەژمار نەكرێت.

خوا پەنامان بدات گەر دوژمنانمان وڵاتەكەمان داگیر بكەن و تاوانی بێشومار و بە بیردا نەهاتوومان بەرامبەر ئەنجام بدەن، ئێمە هێشتا مافی ئەوەمان نییە بە هەمان شێوە ڕووبەڕوویان ببینەوە، بە هیچ جۆرێك ناتوانین كردارێكی وایان بەرامبەر ئەنجام بدەین كە خۆی لە خۆیدا گوناه بێت. گەر ئەوانەی بەرامبەرمان دوژمنی سەرسەختیشمان بن لە پێشهاتی جەنگدا هەرگیز ناتوانین منداڵەكانیان لەناو بەرین یان چاو ببڕینە ناموسی كەسیان یاخود پەنجەمان بەر ئافرەتانیان بكەوێت؛ بە پێچەوانەوە بەرامبەر پەروەردگار بەرپرسیار دەبین. وەك چۆن ستەم كردنی ئەوان لە ئێمە واتای ئەوە نییە ئێمەش دەتوانین ستەمیان بەرامبەر بكەین، بێگومان هەڵەكانیشیان نابنە هۆكاری بێ بەریكردنی گوناهەكانی ئێمە. بەم جۆرە ڕەنگە گەر كەسێك غەیبەتمان بكات و لە پشتەوە قسەمان پێ

بڵێت، بە جۆرێکی ناشرین و بە بیردا نەهاتوو سووکایەتیمان پێ بکات، ئێمەش هەمان کاری لەگەڵدا بکەینەوە، ئەوا لە گوناهەکەدا بەشدار دەبین، لە ڕۆژی قیامەتیشدا بەرامبەر غەیبەتەکەمان و ئەوەی وتوومانە بەرپرسیار دەبین. بەڵێ، یەکێك لە بناغە سەرەکییەکانی ئیسلام کە ئیلهام لە فەرموودەی "نابێت زیان بەکەس بگەیەنرێت و زیان بە زیان وەڵام بدرێتەوە"[1] وەردەگرێت بریتییە لەو پرەنسیپەی کە دەڵێت "کاتێك کەسێك گوناهێکمان بەرامبەر ئەنجام دەدات، ڕێگە نادرێت ئێمەش ئەو گوناهە ئەنجام بدەینەوە". لە قورئانی پیرۆزدا بە شێوازێکی جیاواز سەرنج بۆ ئەم بابەتە ڕاکێشراوە و خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ ۚ ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾

(المائدة: ٥-٨)

"نەکا هەڵویستی زاڵمانە و قین و نەفرەتی کۆمەڵێك بەرامبەر ئێوە و ئەو ڕقەی ئێوە بەرامبەر ئەوان لە دڵتاندا دروست بووە، بەرەو نادادپەروەریی کێشتان بکات. دادپەروەر بن، دیارە کە گونجاوترین هەڵسوکەوت بۆ تەقوا ئەمەیە"

با هەوڵ بدەین تا دەتوانین ئەو خراپە و سووکایەتییانە لە سینەماندا بتوێنینەوە کە بەرامبەرمان دەکرێن، با نەهێڵین ئەو برینەی تووڕەیی دروستی کردووە گەورە ببێت و ببێتە ڕق و کینە. لەبەر ئەوەی ئەو هەستی ڕق و کینەیە هەر کە دەرفەتی بۆ ڕەخسا لە ئامادەباشیدا دەبێت بۆ تۆڵەسەندنەوە. با لێرەدا هەوڵ بدەین ئیرادەمان بخەینە گەڕ بۆ

١. حاكم، المستدرك ٢/٦٦.

تواندنەوەی ئەو خراپانەی بەرامبەرمان دەکرێت، تەقەلا بدەین وەك چۆن بەرگەهەوا بەردە ئاسمانییەکان ورد و خاش دەکات، کاریگەرییان نەهێڵین و بە ناوە جوانەکانی "العفو" و "الغفور"ی خوای گەورەوە خۆمان برازێنینەوە وئێمەش و بەخشندە و لێبوردە بین، تا ئەو خراپە و سووکایەتی و ئاوانانەی لەنێو سینەماندا دەیانتوێنینەوە، ببنە تیشکی ئومێد ئەوەی بە دڵێکی بێ خەوشەوە بگەین بە خوای گەورە. با وا بکەین تا ئەو هێرش و خراپانەی لەنێو سینەماندا تواندوومانەتەوە بەرەو غەیبەت نەماندەنە بەر و زمانمان لە ئاواتی تۆڵەسەندنەوە بپارێزن. نزامان ئەوەیە خوای گەورە ویژدانێکی فراوانی وامان بداتێ، ئیرادەیەکی بەهێزی وامان پێ ببەخشێت کە بتوانین خراپەکان بە چاکە بەرپەرچ بدەینەوە!

## ئیرەیی

"ئیرەیی" کە بە بەخیلی و حەسوودیش ناو دەبرێت، بریتییە لە هەستی هەرسنەکردنی ئەو تایبەتمەندی و لایەنە باشانەی لە کەسێکدا بوونیان هەیە. بە دەربڕینێکی تر ئیرەیی ئاسوودەیی ناخە لە بەرامبەر بوونی ئەو توانست و بەخشایشانەی کەسێك دەیەوێت لە خۆیدا هەبێت بەڵام لە کەسێکی تردا هەیە.

ئیرەیی سەرەتا بە تووڕەیی دەردەکەوێت و پاشان دەبێتە قین، وەك چۆن ئاگر دار دەسووتێنێت و بە خەڵووزی دەکات، ئاواش ئیرەیی چاکەکانمان دەخوات و دەیسڕێتەوە.[1] ئیرەیی نایەوێت لە وڵاتی دڵدا ببێتە دراوسێی

١. أبو داود، الأدب ٤٤؛ إبن ماجة، الزهد ٢٢.

ئیمان و هاوسێیەکی وەها قەبووڵ ناکات.[1] دەرخستنی ئیرەیی و حەزکردن بە شەرمەزاربوونی خەڵکی بە جۆرێك سووتێنەر و ڕووخێنەرە وەك ئەوەی بە مووشەدەمە (هەمانە) ئاگر خۆش بکەیت؛ شاردنەوەشی لە دڵدا هەڵەیەکی گەورەیە چونکە دەبێتە ڕێگرێك لەبەردەم دڵدا کە ناهێڵێت ببێتە ئاوێنەی فەیزەکان.

ئیرەیی بە مانایەکی تر ڕووبەڕووبوونەوەی بڕیاری خوای گەورەیە. چونکە خوای گەورە تاکە زاتە کە بڕیار دەدات چی بە کێ بدات و بە نسیبی بکات. ڕازی نەبوون بەم بڕیارە و مانەوە لە نێو هەستی ئیرەییدا نیشانەی نەخۆشییە و ئەم نەخۆشیەش زۆرترین زیان بە خاوەنەکەی دەگەیەنێت. بەڵێ وەك موعەللیم ناجی دەڵێت:

حەسەد بە کەم مەزانە قوربان
حەسەد حاسیدی دەکا سەرگەردان

ئیرەیی و حەسوودی زیان بەو کەسە دەگەیەنێت کە ئیرەییەکە دەبات وەك لەوەی زیان لەوە بدات کە ئیرەیی پێ براوە. ئەو کەسەی لەم حاڵەدایە هەمیشە لەنێو ئەم نائارامییەدا دەتلێتەوە و ڕۆژ تا ئێوارە بە کینە و نەفرەتەوە لەو لوتفانە دەڕوانێت کە کەسی بەرامبەر پێی بەخشراوە و لە بەرامبەریاندا خەریکە دڵی شەق ئەبات؛ تەوەججوهی خوا بۆ ئەو کەسە دەخاتە ژێر پرسیارەوە، دوعای بەد لەو کەسە دەکات و خۆی دەخواتەوە و ژیانیشی دەخاتە بارێکی وەهاوە نەتوانێت لێی دەربچێت. بۆیە هەندێك جار کەسەکە بە کەم تەماشا دەکات، هەندێك جار غەیبەتی دەکات،

---

١. النسائي، الجهاد ٨.

هەندێکجاریش بوختانی بۆ هەڵدەبەستێت و بە هەستێکی دوژمنانەوە بۆی دەڕوانێت.

ئەوەی بەم هەستانەوە هەڵسوکەوت دەکات زوو زوو پەنا بۆ غەیبەت دەبات و دەیەوێت کەسایەتیی ئەو کەسە بشکێنێت کە ئیرەیی پێ دەبات و بۆ کپکردنەوەی ئیرەییەکەی لە ئامادەنەبوونیدا کەسایەتی دەشکێنێت. لەم بارودۆخەدا بۆ ئەوەی ڕێ لە غەیبەت بگیرێت دەبێت لە پێشدا پێش بە ئیرەیی بگیرێت.

وەك هەر نەخۆشییەکی تر، دەستنیشانکردنی زووی نەخۆشی و نائارامی ئیرەییش گەلێ گرنگە. لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر ئەو کەسەی ئەم هەستەی تێدایە تا زووە هەوڵی سڕینەوەی بکات و تەقەلا بدات توانستی لێبووردەیی و بەرگەگرتنی بڵندیی کەسانی تر لە خۆیدا جێ بکاتەوە، ڕوو بکاتە توانا و لێهاتنەکانی خۆی و بە خۆیەوە سەرقاڵ بێت. پشت بە خوا بەم جۆرە بە نزمکردنەوەی پلەی ئیرەیی، لە ئاستێکدا ڕێ لە وێرانکارییەکانی حەسوودیی و غەیبەتکردن دەگیرێت. لە لایەکی ترەوە ئەم نائارامییە بێ ئەوەی بدرێتە دەرەوە، هەر لە ناخدا دەسڕێتەوە و گەر ئەو کەسەی ئیرەیی دەبات، لە ڕێگەی خۆ نوێکردنەوەی بەردەوامەوە بەرەو ژیانی دڵ و ڕۆح وەربچەرخێنرێت، ئەوا ئەم هەستە کوشندەیە، پشت بە خوا گەر تا ئاستێکیش بێت کپ دەکرێتەوە.

یەکێك لەو لایەنانەی غەیبەت بواری گەشەکردنی تێدا بەدەست دەهێنێت، جیاوازیی سیاسی و مەزهەبی و مەشرەبەکانە. پارتیزانی و لایەنگریی حیزبی مرۆڤ دەهێنێتە خاڵێکی وەهاوە کەسێکی شەیتان

سیفەتی سەر بە لایەنەکەی خۆی وەك وەلی تەماشا بکات و نیشانی بدات. بە پێچەوانەوە ئامادەیە کەسێکی زۆر بەڕێز و خاوەن کەسایەتی کە وەك خۆی بیر ناکاتەوە و سەر بە لایەنێکی ترە، وەك شەیتان تەماشا بکات و نیشانی بدات. ئەم تێڕوانینە هەڵەیە چاوی مرۆڤ بە جۆرێك کوێر دەکات کە هەموو کەس بەهاکانی خۆی بە بێخەوش دەزانێت و بانگەشەی ئەوە دەکات کە ڕاستی تەنها لای خۆیەتی و بێجگە لەو هەمووان هەڵەن.

ئەو مرۆڤانەی خاوەنی هەستێکی وەها کوێرن، وایان لێدێت تەنانەت شتە جوانەکانی بەرامبەریش بە هەڵە ببینن، هەر دەرفەتیشیان بۆ ڕەخسا غەیبەتیان دەکەن. هەر وەك خەیاڵپەرستێك، شەیتان باشییەکانی بەرامبەری بە خراپە نیشان دەدات. مرۆڤە باشەکانی وەك خراپ پێ دەناسێنێت. کە وای لێهات هەروەك ئاسانی ئاو خواردنەوە غەیبەت دەکات، بۆ ئابڕووبردنی کەسی بەرامبەر و پڕوپاگەندەکردن بۆ خۆی، چەندین درۆ و بوختان لەملاولا دەکات. ئەو مرۆڤانەش کە لەسەر ئەم ڕێیەن نە لە دونیادا بەرەکەتیان دەستدەکەوێت، نە لە دوا ڕۆژدا، ئاکامی ئەمەش تەنها نائومێدی دەبێت.

بەڵێ، ڕەنگە ئیماندارێك خۆزگە بە براکەی بخوازێت، بەڵام نابێت هەرگیز بکەوێتە نێو ئیرەییەکی واهاوە بەرەو حەسوودی و غەیبەت بیداتە بەر. جوانە بڵێت "خۆزگە خوای گەورە منیشی وەك ئەو برایەم لێدەکرد..." بەم جۆرە لە ڕێگەی دوعاوە نرخاندنی خۆی دەربخات. زۆر گرنگیشە ئەم نرخاندنە ڕووبەڕوو بێت، گەر لە ئامادەنەبوونیشیدا بوو زۆر گرنگە بە جۆرێك بێت، براکەی بیبیستێتەوە. کاتێك یەکێك لە

هاوەڵان بە پێغەمبەری ئازیزی وت "فڵانە کەسی هاوڕێم خۆشدەوێت." ئازیزیشمان (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) فەرمووی "برۆ بە هاوڕێکەت بڵێ کە خۆشم دەوێت". هەتا ئێمە بە باش باسی هاوڕێکانمان بکەین، ئەوانیش مامەڵەی خراپمان لەگەڵ ناکەن و دواجار ڕۆژێك دێت دەرگاکانی دڵیانمان بۆ دەخەنە سەر پشت.

بۆ پارێزگاریکردن لە زمانمان، پێویستە لە پێشدا گەر هەبێت دەستنیشانی نەخۆشی ئیرەیی بکەین و دواتریش بە دوای چارەسەرکردنیدا بگەڕێین. لەم چارەسەرەدا چەند سەرکەوتوو بین، ئینشائەڵڵا لە بابەتی غەیبەتیشدا ئەوەندە ئەنجامی ئەرێنی بەدەست دێنین. خوای گەورە هەموومان لە بەرامبەر نەخۆشییە مەعنەوییەکاندا هۆشدار بکات و بۆ چارەسەریشیان سەرکەوتوومان بکات...

## سایکۆلۆجیای ڕەنگگرتنی چواردەور و ترسی تەنیا مانەوە

یەکێك لەو هۆکارانەی ڕێ بۆ غەیبەت خۆش دەکات و وا دەکات گوێ لە غەیبەت بگیرێت، بریتییە لە شوێنکەوتەیی ئەوانی دی و خۆ ڕێکخستن و گونجان لەگەڵ ئەو کەش و هەوایەی لە کۆڕی دۆستاندا دێتە ئاراوە. کاتێك لەم جۆرە کۆڕانەدا غەیبەت دەکرێت، مرۆڤ بۆ ئەوەی لە هاوڕێیانی دانەبڕێت و دۆستایەتییان لەدەست نەدات، بەشداری غەیبەتەکە دەکات یاخود گوێیان لێدەگرێت و نایێتە بەربەست

لەبەردەم غەیبەت کردنیاندا. چونکە هەستدەکات گەر ئاگاداریان بکاتەوە ڕەنگە سەرنج و تەنانەت هەڵوێستی چواردەورەکەی سەبارەت بە خۆی بگۆڕێت. یەکسەر ئەوە دێنێتە پێش چاوی کە لەلایەن کەسانی ترەوە تانەی لێدەدرێت و لە کۆڕی دۆستاندا دادەبڕێنرێت. بەڵام لە کاتێکدا بابەتەکە بە گوێرەی پرەنسیپەکانی ڕەوشتی ئیسلام هەڵدەسەنگێنین، ناکرێت ئیماندار لەپاڵ هەڵەدا بوەستێت. کاتێك خراپەیەکی بینی گەر توانی بە دەستی دەیگۆڕێت، گەر نا بە زمانی هۆشداری دەدات و ڕاستی نیشان دەدات. گەر ئەمەشی لە تواناداا نەبوو هیچ نەبێت وەك ئەوەی ئیمان داخوازیەتی، لە دڵەوە ناڕەحەت دەبێت و هەست بە ناخۆشی دەکات. گەر کەسێك ئەم هەستەی تێدا نیە، ئەو کات با دابنیشێت و بیرێك بکاتەوە. چونکە گەر ئەم هەڵوێستە ناوەکییەی کە بە لاوازترین ئەڵقەی ئیمان دەناسرێت تێیدا نەبوو، مانای وایە لە بەهاکانی ئیمان و ئیسلامدا داخورانێك هەیە. لەم دۆخەدا گرنگە چاو بە هەندێ شتدا بخشێنرێتەوە.

جەنابی حەق لە ڕێگەی پێغەمبەرەوە بە سەرجەم ئیمانداران دەفەرموێت:

﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِى حَدِيثٍ غَيْرِهِۦ ۚ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ ٱلشَّيْطَٰنُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ ٱلذِّكْرَىٰ مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ (الأنعام: ٦٨)

"ئەگەر دیتن ڕۆچووبوون لە تانە و تەشەر و ئینکار کردنی قورئاندا، ڕوویان لێ وەربچەرخێنە و مەچۆرە ناویان تا باسەکە دەگۆڕن و دەچنە ناو باسێکی ترەوە. خۆ ئەگەر جارێ شەیتان ئەم ئامۆژگارییەی لەبیر

بردینەوە و چوویتە ناویان، ئەوا کە بیرت کەوتەوە ئیتر جارێکی تر لەگەڵ کۆمەڵی ستەمکاران دامەنیشە".

دیسان کاتێک لە تاوانبارانی ئەهلی دۆزەخ دەپرسرێت "چی بوو ئێوەی هێنایە دۆزەخ؟" لە وەڵامدا دەڵێن:

﴿ قَالُوا۟ لَمۡ نَكُ مِنَ ٱلۡمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمۡ نَكُ نُطۡعِمُ ٱلۡمِسۡكِينَ ﴿٤٤﴾ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلۡخَآئِضِينَ ﴿٤٥﴾ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴿٤٦﴾ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلۡيَقِينُ ﴾

(المدثر: ٤٠-٤٧)

"ئێمە نوێژکەر نەبووین. هەژارانمان تێرنەدەکرد و پێویستییەکانیانمان دابین نەدەکرد. لەگەڵ هەرزەگۆیاندا بە بیروڕای پووچ و بێدینیانەوە خەریك ئەبووین و باوەڕمان بە ڕۆژی جەزادانەوە نەبوو. تا شتە ڕاستەکەمان بۆ هات کە مردنە."

وا دەڵێن و دان بە تاوانەکانیاندا دەنێن. بەڵێ، تاوانێکی بەرچاوی ئەوان کە لە دونیادا ئەنجامیانداوە و بووەتە هۆکاری چوونە دۆزەخیان بریتییە لە خۆ خەلافاندن بە کار و قسەی بێهوودە و پڕکردنی مەجلیسەکانیان لە غەیبەت و بوختان و سوکایەتی پێ کردن و سیفەتی کافرانەی لەم جۆرانە.

پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) بیرمان دەخاتەوە کە پێویستە زۆر وریا بین لە هەڵبژاردنی دۆست و هاوڕێیانماندا و دەفەرموێت "مرۆڤ لەسەر ئاینی هاوڕێکەیەتی. مادەم وایە بزانن کێ بە هاوڕێی خۆتان دەگرن!"[1]. پێویستە مرۆڤ هاوڕێکانی لەنێو ئەوانەدا هەڵبژێرێت کە لە خواوە نزیکن تا لە دونیا و دوارۆژدا پاڵپشتی بن. لە مەجلیسی مرۆڤە

---

١. أبو داود، الأدب ١٦؛ الترمذي، الزهد ٤٥.

خاوەن کەسایەتییە ڕەفتار جوانەکاندا کەشی مەعنەوی زیکر و سوحبەتی جانان باڵادەستە. لەو شوێنانەدا وشە جوانەکان بە هەموو پاراوی و خاوێنیی خۆیانەوە لە زوبان و دڵەکانەوە بۆ خوا بڵند دەبنەوە. جا فریشتەکان لە کاتی نۆرە گۆڕینەدا سەردانی شوێنی ئەو مرۆڤە بەڕێزانە دەکەن و بە خوای تەعالا دەڵێن "پەروەردگارا! هەر کات ئێمە دەور و تەسلیمی مۆرەکانمان دەکەین دەبینین ئەوان نوێژ دەکەن". شەیتان ناتوانێت بچێتە نێو ئەو مەجلیسانەوە، فریشتەکان بە پەنجەیان مەردانی نێو ئەو مەجلیسانە نیشانی "ساکینانی مەلەئی ئەعلا" دەدەن. شوێنی ئەوان ئەو مەجلیسانەیە کە هەموو بوونەوەر خۆزگەیان پێ دەخوازێت. تەنانەت ئەوانەش کە بە جۆرێك لە جۆرەکان ڕێیان کەوتۆتە ئەو مەجلیسە، وەك چۆن قتمیر لەبەر خاتری هاوەڵانی ئەشکەوت چووە بەهەشتەوە، دەبەخشرێن و ئیلتیفاتیان دەستدەکەوێت.

مرۆڤ چۆن بژی، ئاواش دەمرێت. لە کام مەجلیس و لەگەڵ کام دۆستدا بێت بە دەستکەوتە نائاگاهییەکانی ئەوەوە بەرەو خوای گەورە هەنگاو دەنێت. ئەو کەسانەی بە دۆستیان دەگرین، دەبێت ئەو مەجلیس و دۆستانە بن کە خوای گەورە پێی خۆشە؛ دەبێت خۆمان بەدوور بگرین لەو مەجلیسانەی مەنزڵگەی شەیتانن و تاوانی غەیبەتیان تێدا ئەنجام دەدرێت. لەبەر ئەوەی ویست و ڕەزامەندی خوا گرنگە نەك هەوا و ئارەزووەکانی ئێمە. یەکێك لە دۆستانی حەق بە کورتی و پوختی گوزارشت لەمە دەکات و دەڵێت "گەر ئەو ڕازی بێت، هەموو دونیاش زویر بێت گرنگ نییە. گەر ئەو قەبووڵت بکات، هەموو خەڵك ڕەتت بکاتەوە کاریگەری نییە".[1]

---

١. بەدیعوززەمان سەعید نوورسی، تیشکەکان، تیشکی ٢١.

## سیخوڕی

لە زمانی عەرەبیدا وشەی "التجسس" هەیە کە بە واتای (گەڕان بە دوای هەواڵی باری تەندروستی کەسێکدا) دێت، وشەکە دارِشتەی وشەی "الجسس"ی عەرەبییە کە بە واتای (بەدواداچوونی بێوچان و بە وریاییەنە) بەکاردێت. وشەی "جاسوس"یش لە هەمان ڕەگەوە سەرچاوەی گرتووە. سیخوڕی لە ڕووانگەکانی سیاسی و سەربازی و هاوشێوەیانەوە هەمیشە وەك میتۆدێکی هەواڵگری بەکار هێنراوە. بەڵام بەدەر لە دەزگا هەواڵگرییەکان، هەندێك مرۆڤی وا هەیە کە لەسەر ئاستی کەسیی، خۆی بۆ سیخوڕی تەرخان کردووە. یەکەم ئیشی ئەمانە ئەوەیە بزانن کێ، لە کوێ، کەی، لەگەڵ کێ، بۆچی و چی کردووە؟ بەم جۆرە هەمیشە بە هەستی تەجەسسوسەوە دەژین. لە کاتێکدا ئەنجامدانی سیخوڕییەکی وەها و هەوڵدان بۆ زانینی زانیاری شاراوە و مەحرەمی کەسانی تر، تاوانێکی مەزنە.

قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:

﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ﴾ (الإسراء: ٣٦)

"مەکەوە دووی ئەو شتەی نایزانیت!"، بەم فەرمانە خواییە تەجەسسوس واتە (گەڕان بە دوای دۆخە شاراوەکانی خەڵکی) قەدەغە کردووە. دەربارەی بابەتەکە لە ئایەتێکی پیرۆزی تردا فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجْتَنِبُواْ كَثِيرًا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ ٱلظَّنِّ إِثْمٌ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا ﴾ (الحجرات: ١٢)

"...بە دوای دۆخی شاراوەی یەکدیدا مەگەڕێن".



Scanned by TapScanner

دەپۆشێت.‏"[١]

مالیکی کوڕی ئەنەس دەڵێت "خەڵکی وا دەناسم لە مەدینەدا، ...سانی بێ عەیبیان بە عەیبدار نیشاندەدا دواتر بینیم خۆیان بە عەیب عار لەکەدار بوون. دیسان خەڵکی وام ناسی کە خۆیان عەیبدار بوون ...ڵام نەچوون خۆیان سەرقاڵ بکەن بە عەیب و عاری خەڵکییەوە و ...سیان بکەن. بەم جۆرە عەیب و عارەکانیان لەیاد کران".[٢]

بەپێی گێڕانەوەکان حەزرەتی عومەر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) شەوان لە ...ەدینەدا دەگەڕا. شەوێکیان وەك هەمیشە بۆ پشکنینی دۆخی شار ... ماڵ دەرچوو، گوێی لە دەنگی کەسێك بوو گۆرانی دەوت ئەمیش ...سەر دیوارەکەوە چووە ژوورەوە. لە ژوورەوە بینی کۆمەڵێك دانیشتوون ...ەی دەخۆنەوە، بە خاوەن ماڵەکەی وت "ئەی دوژمنی خوا! وا ...ەستدەکەیت گوناه دەکەیت و خوا بۆتی دادەپۆشێت؟". کابراش بە ...ەمیری ئیماندارانی وت "بووەستە ئەی عومەر! پەلە مەکە یەکسەر ...وکم مەدە!، من یەك گوناهم کردووە بەڵام تۆ لە سێ شتدا هەڵەت کرد: ...ە کاتێکدا خوای گەورە فەرموویەتی ﴿وَلَا تَجَسَّسُوا﴾ (الحجرات:١٢) "بە دوای دۆخی شاراوەی یەکدیدا مەگەڕێن"، کەچی تۆ پێچەوانەی ...ەمە ڕەفتارت کرد. دیسان خوای تەعالا دەفەرموێت:

﴿وَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَابِهَا﴾ (البقرة:١٨٩)

"لە دەرگاوە بچنە نێو ماڵەکانەوە".

---

٢. البخاري، المظالم ٣؛ مسلم، البر ٥٨.

١. السخاوي، الضوء اللامع ١/١٠٦.

"تۆ لەسەر دیوارەوە هاتیتە ژوورەوە. وە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدْخُلُواْ بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهْلِهَا ﴾ (النور: ٢٤-٢٧)

"ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! بێ ئەوەی مۆڵەت لە خاوەنەکانیان وەربگرن و سەلام بکەن، مەچنە نێو ماڵی غەیری ماڵی خۆتانەوە".

کەچی تۆ بێ مۆڵەت خواستن هاتیتە نێو ماڵی من و مەجلیسەکەمەوە."

کاتێك حەزرەتی عومەر (رضيَ اللهُ عَنْهُ) حەق و ڕاستی بینی، لە شوێنی خۆیدا مایەوە، ئەو کە هەوڵی دەدا تا دوا پلە پابەند بێت بە پێوانەکانی حەقانیەتەوە، بەو کەسەی فەرموو "گەر من لێتان ببورم، ئێوەش تەوبە دەکەن و لێم دەبورن؟"، ئەو کەسەش لە وەڵامدا وتی "بەڵێ"[1] و ڕووداوەکە بە خۆشی کۆتایی هات.

بە داخەوە لەمڕۆماندا، بە بەهانە گەلێکی وەك ئازادی و مافی هەواڵ وەرگرتنەوە زۆر بە ئاسانی عیففەت و کەسایەتی مرۆڤەکان دەکرێنە ئامانج. بەڵام بە پێی پێوانەکانی ئێمە، مافێکی وەها بنەمای نییە و بە هەموو شێوەیەك نادروستە. بە پێچەوانەوە لە هەموو حاڵێکدا دەبێت ڕێز لە مەحرەمیەتی ژیانی مرۆڤ بگیرێت. ئەو پەروەردەیەی وەرمانگرتووە، داخوازی پاراستنی عیففەت و عیصمەتی مرۆڤەکانە. گەر لە ڕوانگەی یاساشەوە تەماشا بکەین، تاوانێك تا ئەو کاتەی دەسەلمێت گومانی لەسەرە و ئەنجامدەرەکەی تەنها بە گومانلێکراو دادەنرێت، هەرگیز کەس تاوانی بەسەردا ناسەپێنرێت و سزا نادرێت تا

١. السيوطي، الدر المنثور ٥٦٨/٧؛ تفسير الألوسي، روح المعاني ١٥٧/٢٦.

دادگایی نەکرێت. خوای گەورەش ئەرکی دەرخستنی کەموکوورِیی و گوناهی مرۆڤەکانی نەداوەتە کەس؛ بە پێچەوانەوە، سیخوڕیی و گەڕانی بە دوای دۆخی شاراوە خەڵکی قەدەغە کردووە. ئەوەی ئیسلام لە پێشدا داوای کرووە، سەرقاڵبوونی مرۆڤە بە گوناهەکانی خۆی و هەوڵدانە بۆ ڕێکخستن و چاککردنیان بە گوێرەی ڕەزامەندیی پەروەردگاری. ئەم جوهد و تەقەلایە لە هەمان کاتدا مرۆڤ بەرەو کەماڵ دەبات. پێویستە مرۆڤ هەمیشە وەك دادوەرێك چاودێری نەفسی خۆی بکات. کاتێك کەموکوورِیی لێ دەبینێت، پێویستە لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکات و مەحکوومی بکات. بەڵام دەبێت هەمیشە لەسەر تەوەرەی گومانباشی لە خەڵکی بڕوانێت، گەر هەڵە و کەموکورتیشیان ببینێت پێویستە هەردەم وەك پارێزەرێك هەوڵ بدات بێ تاوان نیشانیان بدات.

بەڵێ، با دیسان بەبیری بهێنینەوە کە جەنابی حەق ئەرکی ئەوەی نەخستۆتە سەر شانمان کە "فلان کەس ئەم گوناهانەی ئەنجامدا، بۆچی ناوزڕاوتان نەکرد، شایەتیتان لەسەر نەدا، گیانیتان نەکێشا؟". لە تاوانەکانی وەك زینا و دزی و هاوشێوەیاندا دۆزینەوە و سزادانی تاوانبار کاری دەوڵەتە. گەر تاوان بەرامبەر دەوڵەت و کۆمەڵگا ئەنجام بدرێت، ئەوا مافی گشتییە و مانای وایە لە هەمان کاتدا ئەم مافانە مافی خوای گەورەیە. ئەوەی پێویستە دەربارەی ئەم تاوانانە ئەنجام بدرێت، لایەنی پەیوەندیدار و بەرپرسان ئەنجامی دەدەن.

مامۆستا محمەد فەتحوڵڵا گولەن هەستیارانە لەم بابەتە دەڕوانێت و بەم ڕستە سەرنج ڕاکێشانە نموونەی بۆ دێنێتەوە: "یەکێك لەو

شیکردنەوانەی لەسەر (تەریقەتی موحەممەدییە) نووسراوە و ئیمام خادیمی نووسیویەتی دەڵێت "گەر ئیماندارێکت تەنانەت لە کاتی زیناشدا بینی، ڕاستەوخۆ بڕیار مەدە. چاوت بسڕە و بڵێ "ئای خوایە، ئەم مرۆڤە کارێکی وا قێزەون ئەنجام نادات!"؛ دیسان تەماشایەك بکەو و بڵێ "ئەوە؟". گەر ئەو بێت، بڵێ "ڕەنگە دیسان بە هەڵە بینیبێتم"؛ جارێکی تریش چاوەکانت بە درۆ بخەرەوە و بیانسڕە. گەر هێشتا ئەو کەسەت دەبینی بەسەر ئەو کارە خراپەوە، بڵێ "پەروەردگارا! لەم بارە ناشرینە ڕزگاری بکە، منیش لە گوناهێکی وا بپارێزە" و پاشان بڕۆ". حەزرەتی ئیمامم زۆر خۆشدەوێت، زۆر حورمەتم بەرامبەری هەیە بەڵام ئەم وتانەی بە زۆر دەزانم. بە ڕای من، کاتێك بینیت ئیماندارێك لە شوێنێکدا لە حاڵێکی وا خراپدایە؛ هەر کە یەکەم جار بەرچاوت کەوت، بێ ئەوەی سیخوڕیی بەسەرەوە بکەیت، بێ ئەوەی بکەویتە شوێن دەستنیشانکردن و دیاریکردنی دۆخەکە، پێش ئەوەی ئەو فۆتۆگرافە نەشیاوانە لە چاوتەوە بخزێنە نێو دڵت و لە قازانی ناخدا بتوێنەوە و بچنە نێو دەفری بڕیاردانەوە، پشتت هەڵکە و بڵێ "خوایە گیان ڕێنوێنی بەندە گوناهکارەکانت بکە و لە منیش خۆش بە، پاشان دوورکەوەرەوە و ئەوەش کە بینیوتە لەبیری بکە."[1]

مامۆستا لە شوێنێکی تردا لەمەڕ هەمان بابەت بەم جۆرە دەدوێ "ئەگەر کەسێکتان لەنێو هەڵسوکەوتێکی نەشیاودا بینی، دەبێت باوەڕ بە چاوانتان نەکەن و بڵێن "چاوەکانم بە هەڵەمدا دەبەن". ئایا دەڵێن چاومان بە هەڵەماندا نابات؟ چوزانن؛ ڕەنگە شەیتان بۆ ئەوەی بەرامبەر براکەتان

١. م.فەتحوڵلا گولەن، ئاسۆکانی غوربەت، بارانەکانی پاش نیوەڕۆ.

بتانخاتە نێو گومانخراپییەوە، خۆی لە شێوەی ئەودا نیشاندابێت..."

باسکردن و تانەدان لە کەموکورتی و هەڵەکان مەردایەتی نییە: مەردایەتی ڕاستەقینە بریتییە لەوەی پەردەیەکی دی بدەیت بەسەر ئەو هەڵەیەدا و داوای چاککردن و ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵەیە لە پەروەردگار بکەیت. دواتریش عیبرەت وەربگریت. ڕەنگە ئەمڕۆ پێی ئەو خلیسکاوە، سبەی پێی تۆش بخلیسکێت.

بەلای منەوە یەکەمین پلەی مرۆڤایەتی بریتییە لە نەبینینی هەڵە و کەموکووڕیی کەسانی تر. هەرچی گومانباشیە لە کاتی بینینیدا، ئەوە پلەیەکی نزمترە.[1]

دەبێت ئەم ئامۆژگارییە زێڕینانە هەردەم لە گوێماندا بزرینگێنەوە، کاتێك ڕووانینمان بەرەو ژیانی تایبەتی کەسێکی تر دەترازێت، دەبێت وەك دەستێك کە بەر ئاگر دەکەوێت یەکسەر بیگێڕینەوە. چونکە سەرەنجامی ئەو کەسانەی هەڵەکانی خۆیان چاویان پڕ ناکات، لە پەرێشانی و بێ هیوایی زیاتر نییە.

## گومانخراپی

گومانخراپی واتە بیرکردنەوەی خراپ دەربارەی خەڵکی، پەیوەندییەکی نزیکی لەگەڵ سیخوڕی هەیە و یەکێکە لە گرنگترین ئەو نەخۆشییانەی کە مرۆڤ بەرەو غەیبەت کێش دەکەن. گومانخراپی غەیبەتی دڵە و

---

[1] محەممەدولڵا گولەن، لە بەشێکەوە بۆ بەشێکی تر.

بریتییە لە جێگیربوونی بیرکردنەوەی خراپ دەربارەی کەسانی دی لە نێو دڵدا. گومانخراپی، ئەو ناشرینییەیە کە لە مرۆڤە دڵ و مێشک نەخۆش و دەروون تێکچووەکاندا بەدی دەکرێت. ئەو، بۆسەیەکی شەیتانە کە ژیانی ماددی و مەعنەوی کۆمەڵگا دەکاتە ئامانج. جەنابی حەق، باس لە ناشرینی گومانخراپی دەکات و دەفەرموێت:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱجْتَنِبُوا۟ كَثِيرًا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ ٱلظَّنِّ إِثْمٌ وَلَا تَجَسَّسُوا۟ ...﴾

(الحجرات: ١٢)

''ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! زۆر ئاگاتان لە گومان بێت. چونکە بەشێك لە گومانەکان گوناهن. بە دوای دۆخی شاراوەی یەکدیدا مەگەڕێن.''

بەم جۆرە ئاگاداری کردووینەتەوە لە بیری گومانخراپی کە ئاشتەوایی و یەکڕیزیی ئیمانداران دەخاتە مەترسییەوە.

بەشێك لە گومان هەیە جوانە، بەشێکی تریشی ناشرینە. بە جوانەکەیان دەوترێت "گومانباشی" و بە ناشرینەکەشیان "گومانخراپی". بیرکردنەوەی جوان دەربارەی خوا و ئیمانداران پێویستە، بیرکردنەوەی خراپیش دەربارەی خەڵکی ڕێپێدراو نییە. گەر گومانخراپی بەرامبەر ئەو مرۆڤانەی ناهەقیکردن و گوناهکارییان ئاشکرایە قەدەغەکراویش نەبێت، شتێکە بێ پاداشت و بێ سود.

تێڕوانینی مرۆڤ بۆ چواردەوری چۆن بێت، پێکهاتەی کەسایەتی و ڕۆحیشی بە تێپەڕینی کات لە چوارچێوەی ئەو بیرکردنەوەیەدا ڕەنگ دەگرێت. وەك چۆن جوانبینین زەمینە بۆ جوان بیرکردنەوە ساز دەکات،

بەدبینینش زەمینەی بەد بیركردنەوە دەهێنێتە بوون. لە نەخشاندنی هەڵكەوتەی كەسایەتی و ڕۆحیدا، بیركردنەوە و بەرجەستەكردن دوو جەمسەری زۆر گرنگن. ئەو مرۆڤەی خۆی لەسەر جوانبینین ڕاهێناوە، كرداری جوانیش بەرجەستە دەكات، بە شێوازێكی ئەرێنی لە شتەكان و ڕووداوەكان دەڕوانێت، ئەو مرۆڤەش كە بەم حاڵەتە ڕۆحییەوە هەڵسوكەوت دەكات، چێژ لە ژیانی وەردەگرێت.

بە پێچەوانەشەوە ئەوەی خۆی لەسەر بەدبینی دەربارەی هەموو شتێك ڕاهێنابێت و بەردەوام چاوی لەسەر بەشی خاڵی پەرداخەكە بێت، هەرگیز هەست بە جوانی ناكات و، بە ئەرێنیانە بیر ناكاتەوە و چێژی ڕاستەقینەی ژیانیش وەرناگرێت. گرنگترین هێزێك كە ڕۆحە بەرز و كەسایەتییە بێ خەوشەكان دەربخات، بیركردنەوەی جوان و نیەتی پاكە. ئەم كەسایەتیانە لەسەر ئاستی كەسیی خۆیان ژیانێكی بەهەشت ئاسا دەژین و وەك چۆن باخچەی گوڵان بۆنی خۆش بە چواردەوریدا پەرش دەكاتەوە، ئەمانیش هەردەم وزەی پۆزەتیڤ بڵاو دەكەنەوە.

یەكێك لەو ڕەوشتە جوانانەی ئیسلام دەیەوێت بیبەخشێتە هاوڕازانی خۆی ڕوانینی ئەرێنییە بۆ شتەكان و ڕووداوەكان، ئەمەش زۆر جار بە "گومانباشی" ناودەبرێت. پێویستە هێندەی لە دەستمان بێت گومانی باش بە مرۆڤەكان بەرین و دەستپێشخەر بین لە بیركردنەوەی جوان دەربارەیان. تا ئەو كاتەی خراپەكان بە نیشانە و بەڵگەكانی خۆیانەوە دەردەكەون، هەموو مرۆڤێك بێتاوانە. ئەم دەستوورە لە یاسادا بەم جۆرە گوزارشتی لێ دەكرێت "بنەما لەسەر ئەستۆ پاكییە، هەتا تاوان لەسەر

کەسێک نەسەلمێت ئەو کەسە بە بێتاوان هەژمار دەکرێت" بۆیە پێویستە لەسەر هەموو تاکێک پابەندی ئەم دەستوورە بێت کە یەکێکە لە پرەنسیپە بنچینەییەکانی یاسا. لە بەرامبەر ئەمەدا ئاینە پیرۆزەکەمان، تا بڵێیت دوورە لە گومانخراپی و بە هیچ جۆرێک پەسەندی ناکات و، مافی ژیانی پێ نادات. چونکە سەرچاوەی زۆرێک لە خراپکارییەکانە.

"بینینی هەموو کەس وەک خۆت"، ئەوانەی نەخۆشییەکی ڕۆحییان هەیە، کاتێک تەماشای چواردەوریان دەکەن، لە هاوێنەی ئەو نەخۆشییە ڕۆحییەوە تەماشای دەکەن و وا هەست دەکەن هەمان نەخۆشی لە کەسانی تریشدا بوونی هەیە و هەمووان نەخۆشن. هەر وەک بڵێیت "هەمووان لە چاویلکەکەی خۆیانەوە دەبینن" بۆ نموونە دز کە دونیاکەی پڕ لە دزی یە و چاوی بڕیوەتە کردنەوەی دەرگا قفڵدراوەکانی خەڵکی. کاتێک بە ڕێگادا دەڕوات، کەسێک ببینێت بە تیلەی چاو تەماشای جامخانەی دوکانەکان دەکات، یەکسەر حوکمی "دز"ی بەسەردا دەدات. نیەت دەخوێنێتەوە و لە خۆڕا دەیسەپێنێت بە سەریدا. ئەم موبتەلایانەی نەخۆشیی دڵ و ڕۆح، لەنێو حاڵەتێکی ڕۆحی پارانۆییدا (شلەژاوی) هەموو شتێک بە خراپ لێکدەدەنەوە؛ هەموو سێبەرێک بە ئەسڵ دەبینن و هەموو ئەگەرێکیش وەک بوون هەڵدەسەنگێنن. دەستدەکەن بە تواندنەوەی ئەو زانیارییە خاوانەی کە لە هەرێمی گومان تێپەڕ ناکەن لەنێو قازانی دڵدا و دواتر ڕۆی دەکەنە نێو قاڵبی جیا جیاوە و دەیانخەنە شوێنی زانیاری دروست و حوکمیان لێ وەردەگرن. لەپاش هەموو ئەمانە بەو حوکمە هەڵانەی لەسەر گومان و ئەگەرەکان بنیاتیان ناوە، بڕیار لەسەر مرۆڤەکان دەدەن و تاوانباریان دەکەن.

بەدگومانی، نەك لە قوتابییەكی قورئان، بگرە لە ئیماندارێكی زۆر ئاساییش ناوەشێتەوە. بەڵام بە داخەوە ئەم دەردە لەم دواییەدا هێندە بڵاو بووەتەوە، تەنانەت كاری لە سەرڕاسترین ئیماندارانیش كردووە. دەبینین كە زۆربەی ئەوانەی دونیای هەست و نەستیان ەێندەی تۆزقاڵێك شێواوە، بەداخەوە، گومان و دوودڵییەكی زۆر باڵی بەسەریاندا كێشاوە. دەبینرێت كە زۆرێك لەوانەی چواردەورمان بە دیدگای جیا جیاوە تووشی دەردی گومانخراپی هاتوون و وەك گۆشت و خوێن لەگەڵ ئەم عیللەتەدا تێكەڵبوون و وەهمی جۆراوجۆر چواردەوریانی تەنیوە.

ئەم گوناهە تەجەللی جۆراوجۆری هەیە، وەك؛ خەت پێداهێنان و بە دەم مەحكوم كردنی كەسایەتی بەرامبەر بەبۆنەی قسەیەكییەوە یان سفركردنەوەی ئەو كەسە بەهۆی دۆخی یەك ساتییەوە، بەم جۆرە وەك دووپشكێك لە سوچێكدا خۆی مەڵاس دەدات و ژەهر دەخاتە نێو دڵی ئیماندارانەوە و وا دەكات ئەو كەسە بە شێوەیەكی بەرچاو شكۆی خۆی لەدەست بدات. ئەمە لە كاتێكدایە ئەو قورئانەی بۆ بەختەوەریی دونیا و دوارۆژ كردوومانەتە ڕابەرمان، فەرمەنمان پێ دەكات گوێیەكانمان بە ڕووی قسەی پاشەملەدا دابخەین و چاومان بە ڕووی دیمەنە نەشیاوەكاندا بنوقێنین و پاشماوەكانی بەدگومانی لەنێو نەستماندا خاوێن بكەینەوە و هەستیارانە مامەڵە بكەین تا پاشماوەی وا كۆ نەبێتەوە و دواجاریش زمانمان بپارێزین تا خۆی نەدات لە قەرەی غەیبەت و قسەی نەشیاو.

هەڵسوكەوتی لەم جۆرە ڕەنگ گرتنە بە ڕەنگی ڕەوشتی خوای گەورە. چونكە خوای باڵادەست هیچ كەسێكی بەبۆنەی گوناهێكەوە

نەبردووە بە ناخی زەویدا و لە ڕەحمەتی خۆی بێبەشی نەکردووە. سەرەڕای ئەو هەموو کارە بێزراوەی ئەمڕۆ لە دونیادا ئەنجام دەدرێت، دەروازەکانی ئاسمانی بە کراوەیی هێشتۆتەوە و بارانی لێ نەگرتووینەتەوە و، بە خاکەکەی سفرەکانمان بە چەندین جۆری نیعمەتەکانی دەڕازێنێتەوە.

جارێکیان لە سەردەمی زێڕیندا کابرایەك گەیشت بە کۆمەڵێك کەس، سڵاوی لێ کردن و ئەوانیش سڵاوەکەیان بۆ سەندەوە. پاش ئەوەی ئەو کەسە شوێنەکەی بەجێهێشت، یەکێك لەوانەی نێو کۆمەڵەکە وتی "سوێند بە خوا من کەیفم بەم کابرایە نایەت". ئەوانەی ئەوێش قسەی خراپی ئەو کەسەیان پەسەند نەکرد و پێیانوت "چەندە قسەیەکی خراپت کرد! سوێند بێت دەبێت خۆی لەمە ئاگادار بکەیتەوە!"، بەم جۆرە داوایان لێکرد ئەو کەسە ئاگادار بکاتەوە لەو شتەی کە لەودا پێی خۆش نییە. بۆ ئەم مەبەستە یەکێکی نێو خۆیانیان ڕاسپارد تا بچێتە لای ئەو کابرایە. کاتێك نێردراوەکە گەیشتە لای کەسە غەیبەت کراوەکە، لە دۆخەکە ئاگاداری کردەوە؛ ئەویش پاش گوێ ڕادێران بۆ ئەو قسانەی دەربارەی کرابوون، یەکسەر چووە لای پێغەمبەری خوا و پاش ئەوەی ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە، داوایکرد لەگەڵ ئەو کەسەدا ڕووبەڕووی بکاتەوە. لەم بارەیەوە هەواڵ درایە ئەو پیاوەی غەیبەتەکەی کردبوو و پاش ماوەیەك ئەویش هات بۆ کۆڕی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ). کاتێك پێغەمبەری خوا دۆخەکەی پێ فەرموو، ئەویش پشتڕاستی کردەوە. پێغەمبەری ئازیز (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) هۆکاری ئەم کینەیەی بەرامبەر ئەو کەسە لێ پرسی. ئەو زاتەش ئەم وەڵامەی دایەوە "ئەی نێردراوی خوا! ئەم زاتە دراوسێی منە و لە نزیکەوە دەیناسم. نەمبینیوە ئەم پیاوە

بێجگە لە پێنج فەرزەی نوێژە كە هەم كەسی پابەند بە دین و هەم كەسی گوناهكار دەیكەن، نوێژی تر ئەنجام بدات.''

ئەو زاتەی سكاڵای لە دەست كرابوو بەم جۆرە بەرگری لە خۆی كرد ''ئەی نێردراوی خوا! لێی بپرسە بزانە من قەت ئەو پێنج فەرزەم درەنگ یاخود بە قەزا كردووە؟؛ كەموكورتییەكم لە دەستنوێژدا نوواندووە؟، یان بێباكانە لەگەڵ ڕكووع و سجوودی نوێژەكاندا مامەڵەم كردووە و پابەند نەبوویم بە ئەركانەكانی نوێژەوە''؟.

پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) ڕووی كردە پیاوەكەی تر و داوای وەڵامی لێكرد. ئەویش وتی ''نەخێر!'' و، پاشان سكاڵای بابەتێكی تری كرد. وتی ''من قەت نەمبینیوە ئەم دراوسێیەم بێجگە لە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان كە هەم كەسی پابەند و هەم گوناهكار دەیگرن، ڕۆژووی تر بگرێت.''

ئەو زاتە بەم جۆرە وەڵامی ئەو تۆمەتەشی دایەوە ''ئەی نێردراوی خوا! لێی بپرسن ئایا قەت بینیویەتی من لە ڕەمەزان بخۆم یان لە ڕەمەزاندا كردەوەیەكی وا ئەنجام بدەم كە خێری ڕۆژووەكەم كەم بكاتەوە؟''

پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) دیسان ڕووی كردە پیاوەكەی دی و داوای وەڵامی لێ كرد. كابراش وتی ''نەخێر''، ئەم جارەیان سێهەمین و دوا سكاڵای خۆی كرد و وتی ''نەمبینیوە ئەم پیاوە بێجگە لەو بڕە زەكاتەی لەسەریەتی و كە هەم كەسی بە ئاین پابەند و هەم كەسی گوناهبار دەیبەخشن، هیچ كاتێك لەبەر خوای گەورە بەخشێت.''

بەم جۆرە وەڵامی ئەم تۆمەتەشی دایەوە "ئەی نێردراوی خوا! دەتوانی لێی بپرسیت، هەرگیز بینیویەتی من سامانەکەم بشارمەوە بۆ ئەوەی زەکات نەدەم، یان وەرگری زەکاتەکەم بهێنم و ببەم و پێی بڵێم "تەنها ئەوەندەت پێ دەدەم و ناتوانم زیاترت پێبدەم؟."

ئەم جارەش پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ڕووی لە سکاڵاکارەکە کرد و چاوەڕێی وەڵامی بوو. ئەویش دیسان لە وەڵامدا وتی "نەخێر!"، پاشان پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) ڕووی کردە پیاوە سکاڵاکارەکە و ئەم ڕستە پەند ئامێزەی ئاڕاستە کرد، فەرمووی "هەستە! ڕەنگە ئەم کەسەی کە سکاڵای دەربارە دەکەی، لە تۆ باشتر و چاکەکارتر بێت."[1]

بەڵێ ئازیزانم! وەك چۆن ڕەنگە ئەو شتەی ئێمە بە خێر دەیبینین لە ڕاستیدا شەڕ بێت، ڕەنگە هەندێك لەو شتانەی بە شەڕیش دەیانبینین، لە ڕاستیدا خێر بن. پێغەمبەری ئازیز (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) دەفەرموێت "قسەکردن لەبارەی هەموو ئەوانەی دەبیسترێت و گەیاندنیان (بەبێ ئەوەی زانیارییەکە پشتڕاست بکرێتەوە) وەك درۆ بەسە بۆ ئەو کەسەی دەیگەیەنێت"[2]، ئازیزمان بەم وتەیەی هۆشدارییەکی زۆر گرنگمان پێ دەدات. خستنەسەر زاری هەموو ئەو شتانەی دەبیسترێن و دەبینرێن گوناهە و نەخۆشییەکی مەترسیدارە کە لەتائیفە مەعنەوییەکانی ئەو کەسە بەرەو مردن دەبات. گەر زمانیشمان لە جێی خۆی نەوەستا و ویستی هەر بدوێت، با بە زیکری خوای گەورەوە سەرقاڵ ببێت، قورئان

١. أحمد بن حنبل، المسند ٤٥٥/٥.

٢. مسلم، مقدمة ٥.

بخوێنێت و، سەرقاڵی ئەو کتێبانە بێت کە ئاسۆی نوێ بەڕووی جیهانی دڵ و ڕۆحدا واڵا دەکەن، تا کاتی بۆ کاری بێهوودە و بەدگۆیی و بەدگومانی و غەیبەت نەمێنێتەوە.

سەعدی شیرازی لە منداڵیدا حەزی لە پەرستشی شەوانە هەبوو، کاتەکانی بە نوێژ و دوعا و خوێندنەوەی قورئانەوە بەسەر دەبرد. شەوێکیان کاتێک قورئانی دەخوێند پرسیاری لە باوکی کرد کە بە پێوەبوو:

- مرۆڤەکان بۆچی شەوەکانیان بە خەو بەسەر دەبەن؟ نەیاندەتوانی هەستن و دوو ڕکات نوێژ بەجێ بهێنن؟ باوکیشی وەڵامێکی پەندئامێزی نە سەرزەنشتەیی دایەوە:

- بریا لەبری نەخەوتن و ڕەخنەگرتن لە خەڵکی، تۆش خەوتبای!

بەدگومانی و غەیبەت گوناهانێکی زۆر بێزراون. هەندێک جار خۆیان لەنێو دەستەواژەی نەرم و بێتاواندا مەڵاس دەدەن و هەستیان پێ ناکرێت. بۆ نموونە نەفست لەپاش ئەنجامدانی چاکەیەکی بچوک بەکسەر هەڵدەستێت و دەڵێت "تەماشا من لە تاریکی شەودا هەڵدەستم بۆ شەونوێژ، بەڵام ڕووناکی کەس لەم چواردەورە ناگرێت. کارێکی چەندە گەورەم ئەنجامدا." ڕەنگە بە بیرکردنەوەی لەم جۆرە پەرستشە سوننەتەکان لە پێش چاودا گەورە بکات و بە گەورەکردنی خۆی هەستێت بە بچووککردنەوەی ئەوانی دی. پێویستە لەم دۆخەدا یەکسەر سنوور بۆ نەفس دابنرێت و بەرپەرچی هێرشە ناپاک و پەنهانەکانی بدرێتەوە.

باپیرانمان وتوویانە "ئاو دەخەوێت دوژمن ناخەوێت." ئەمە زۆر ڕاستە و بەتایبەتیش نەفس و شەیتان کە دوژمنی سەرەکی ئیماندارن،

هیچ ناخەون، هەموو کات لەگەڕی هەیە بکەونە پەلامار بۆ وێرانکاری مرۆڤ و شێواندنی بیری و تێکدانی دڵی. لە قاڵبی دەستەواژەی زۆر بێتاوانانەدا بۆ مەبەستی غەیبەت جێگیر دەکەن و دەیان کردەوەی باشی مرۆڤ بە خۆڵ دەکەن. قسەی وەهات پێ دەکەن، کە وەک ئەو پریشکە ئاگرەی دەکەوێتە نێو دارستانەوە هەموو شتێک دەکاتە خۆڵەمێش. پێویستە تا دوا ڕادە هەستیار بین بەرامبەر ئەم دوژمنە مەترسیدارانە. پێویستە وەک سەربازێکی ئێشکگر، بیست و چوار کاژێر لە ئامادەباشیدا بین.

ئەم دوو دوژمنە بۆ ئەوەی جێی خۆیان لە دونیای مەعنەویماندا بکەنەوە و ئاڵاکانیان لەسەر لوتکە زمڕووتییەکانی دڵدا بچەقێنن، دێن و وات لێدەکەن دەربارەی ئەو هاوڕێیەت کە پێشتر زاهیدانە ژیاوە و ئێستا مۆبیلیاکانی گۆڕیوە و کەلوپەلەکانی نوێکردووەتەوە بڵێیت "ئیدی ئەو لەسەر فەرشی نەرم دادەنیشێت، قەنەفەکانیشی گۆڕیوە؛ دیارە لە ڕێ لایداوە"، بەم شێوەیە دەمانخەنە نێو بەدگومانییەوە و غەیبەتمان پێ دەکەن. یان چاوت دەبڕنە سەر ئەو چەند قاتە جلە جیاوازەی کە برادەرێکی تر لەبەری دەکات و وادەکەن وەک "ئەو پیاوەی تا گەردنی لە ئیسرافدایە" لێی بڕوانیت. ئەمە لە کاتێکدا گرنگ ئەوە نییە ئێمە دەربارەی کەسێک چۆن بیر دەکەینەوە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە خوای گەورە دەربارەی ئێمە چۆن بیر دەکاتەوە. بەپێی پێوانەکانی ئاین گۆڕینی مۆبیلیای ماڵ یاخود بەکارهێنانی چەند قاتە جلێکی جیا جیا تاوان نییە. شایەت ئەگەر ئێمە ئەم جۆرە خەرجییانە بە ئیسراف بزانین ئەوە لە ڕوانگەی گۆشەنیگای خۆمانەوە ئێمە نازانین ئەو هاوڕێیانەمان بە چ دیدگایەکەوە ئەم جۆرە خەرجییانە ئەنجام دەدەن، ڕەنگە حیکمەتگەلێکی

نەزانراو لە پشت هەڵبژاردنەکانی ئەو برایانەمانەوە هەبێت کە جلە جۆراوجۆرەکان لەبەر دەکەن. مادەم دەتوانین بە تێڕوانینێکی لەم شێوەیە لە بابەتەکە بڕوانین، ئیدی دروست نییە هەموو ئەمانە بە شێوازێکی نەرێنی لێك بدەینەوە و دواجار لە دەرگای گومانخراپییەوە بگەینە غەیبەت. ڕەنگە ئەو هاوڕێیەمان بێ هیچ حیکمەتێك ئەو خەرجییەی کردبێت و لە ڕاستیشدا هەر ئیسرافی کردبێت، دەبێت تەنانەت لەم دۆخەشدا گومانی خراپیان پێ نەبەین و دەرگای غەیبەت والاّ نەکەین. جەنابی حەق هەرگیز فەرمانی بە غەیبەت کردنی مرۆڤە موسریفەکان یان بەندە گوناهکارەکان نەکردووە. کە دەتوانین تەوبە لە بەدگومانی و غەیبەت کردنی مرۆڤەکان بکەین و ڕەزامەندی خوای گەورە بەدەست بهێنین، ئیدی هەڵەیەکی گەورەیە بچین لەسەر ڕووداوی ڕۆژێك بۆ هەمیشە بە خراپی لەو کەسە بڕوانین و هەر دەرفەت بوو ناوی بزڕێنین. غەفڵەتێکی گەورەیە بچین چەند وەهم و گومانێك لەسەر ئەو گوناهانە بنیات بنێین کە تەوبەیان لێ کراوە و پشت بە خوا بەخشراون، دیارە ئەمەش بەدگومانییەکی مەترسیدارە و دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوە لە میهرەبانی خوای گەورە.

مامۆستا بەدیعوززەمان لە پاڵ نائومێدی و بە خود سەرسام بوون و لە خۆ بایی بوون (غرور)دا، بەدگومانیشی بە یەك لە چوار نەخۆشییە گەورەکە هەژمار کردووە و، داوای لێکردووین بە چاوی گومانباشییەوە لە چواردەورمان بڕوانین. ئازیزیشمان (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەفەرموێت "گومانباشی، یەکێکە لە جوانییەکانی بەندایەتی مرۆڤ."[١٤٤] هەروەها

١. أبو داود، الأدب ٨١؛ أحمد بن حنبل، المسند ٢/٢٩٧، ٣٠٤، ٤٠٧، ٤٩١؛ إبن حبان، صحيح ٢/٣٩٩.

پەیمانی لە هاوەڵانی ئازیز وەرگرتووە کە بەرامبەر سەرجەم ئیمانداران نیەت پاك بن.

ئیمان داخوازی گومانباشییە.[1] ژیان لە نێو گومانباشیدا نیشانەی تێگەیشتن لە ڕۆحی ئاین و قووڵبوونەوە تێیدا و فراوانی وابەستەیی ئەو دەرکی ئیحسانەیە کە بریتییە لە ئاگاهی چاودێری خوای گەورە. مادەم وایە، وەك چۆن یەکێك لە پیاوچاکان دەڵێت ''گەر پێویست بکات گوێیەکانمان دەخەینە بەر گوللە، بەڵام هەرگیزاو هەرگیز گوێمان بۆ قسەی نەرێنی دەربارەی ئیمانداران هەڵناخەین. گەر پێویست بکات چاوەکانمان دەخەینە بەر تیرباران، بەڵام هەرگیز بە دوای خراپەی براکەماندا ناگەڕێین و، هەڵەکانی ناخەینە بەرچاو. هیچ ئیماندارێك ناکەینە مەحکوومی قسەیەکی یان ڕەفتارێکی یان هەڵوێستێکی و بەم جۆرە دڵمان بە بەدگومانی گەرداوی ناکەین و، بۆ ساتێکیش بێت ئەوە لە یاد ناکەین کە لای خوای گەورە لە چاو و گوێ و دڵیشمان بەرپرسیار دەبین''.

هەمووان بە لە خۆمان باشتر سەیر دەکەین و بە تێگەیشتنی

هەمووان باشن، خراپم من
هەمووان گەنمن، پووشم من

هەڵسوکەوت دەکەین. هەڵە و ناشرینی خۆمان بۆ خەڵکی ناگشتێنین. ناکەوینە خراپکردنی هەندێك دۆخ و هەڵسوکەوت کە حیکمەتیان نازانین. بە تایبەت هەرگیز ناکەوینە نێو بەدگومانی بەدڵ نەبوونی هەندێك

---

١. أبو داود، الجنائز ١٣، الأدب ٨١.

دۆخی سەلەفی ساڵح و ئەو مرۆڤانەی کە پێویستە ڕێزیان بگرین. دواجار بە هەڵەداچوونمان لە گومانباشیدا پێ باشترە وەك ئەوەی لە بەدگومانیدا ڕاست بکەین.[1]

دەبێت هەر کەسە و ئامانجێکی وەك گەیشتن بە ڕەزامەندی خوا بۆ خۆی دابنێت. ئامانجێکی وەها سەرقاڵی فەرمانبەرییە سەرەکییەکەمان دەکات و ناهێڵێت دەست بدەینە باسکردنی ئەم و ئەو و گومانبردنی خراپ بە خەڵکی. ئەو کەشتییەی ڕێڕەوی خۆی وەرنەگرتووە و شوێنی مەبەستی دیاری نەکردووە چاوەڕێ ناکرێت مەودا ببڕێت، بە هەمان شێوەش شتێکی چاوەڕوانکراوە ئەو ئیماندارەی کە بێ ئامانج دەژی خۆی بەو بابەت و کارانەوە سەرقاڵ بکات کە پەیوەندی پێیانەوە نییە. پێم وایە گەورەترین چارەسەری ئەم پەشێوی و ناڕێکییەش وابەستەیی ڕەزامەندیی خوا و ڕێکردنە بەبێ پێ هەڵکەوتن لە هەر لاف و گەزافێکی دەرەوەی بازنەی ڕەزامەندی خوای گەورە. خاڵێکی تر کە پێویستە لەسەری ڕابوەستین بریتییە لە دووربوونی کەسە بەر چاوەکان یاخود نوێنەرانی کەسایەتییە مەعنەوییەکان لەو هەڵسوکەوتانەی دەرگا بۆ بەدگومانی واڵا دەکەن. پێغەمبەری ئازیز (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) فەرمانمان پێ دەکات خۆمان بە دوور بگرین لەو شوێنانەی تۆمەتی تێدا دەبەخشرێتەوە هەروەها لەو ڕەفتارانەی کە دەبنە هۆکاری بەدگومانی. لە ڕاستیدا شەوێکیان کە خۆی لە ئیعتیکافدا بوو حەزرەتی سەفیەی دایکمان (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) هاتە سەردانی، کە ڕۆیشت پێغەمبەریشمان چووە دەرەوە بۆ بەڕێکردنی. لەم کاتەدا دووان لە پیاوانی ئەنسار لەوێوە تێپەڕ دەبوون. کە پێغەمبەری

[1] محەمەدفەتحوللا گولەن، بارانەکانی پاش نیوەڕۆ، مزگێنی شادبوونەوە.

خوایان بینی خێراتربوون لە ڕۆیشتن. پێغەمبەری خواش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) فەرمووی "هێواش بن، (ئەو خێرانی منە) سەفییەی کچی حوییە"، بەم جۆرە بۆی ڕوون کردنەوە. ئەو دوو زاتەش بەم جۆرە وەڵامیان دایەوە "سوبحانەڵڵا، (چۆن دەربارەی تۆ شتی خراپمان بە خەیاڵدا دێت) ئەی نێردراوی خوا!". پێغەمبەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لەسەر ئەمە پێی وتن "بێگومان شەیتان لە جەستەی مرۆڤ و لە خوێنیدا دێت و دەچێت. لەبەر ئەوە ترسم هەبوو شتێکی خراپ بە دڵتاندا بێت"[1].

لەم هەستیارییەی پێغەمبەری خواوە تێدەگەین کە دەبێت ئیماندار شەفاف بێت، هەرگیز نابێت بچێتە نێو ئەو هەڵانەوە کە دەبنە هۆکاری فیتنە و بەدگومانی. بەڵێ، وەك چۆن گومانبردنی خراپ هەڵەیەکی گەورەیە، نواندنی ئەو ڕەفتارانەش کە مرۆڤەکان بۆ ئەم بیرۆکەیە پاڵ دەنێن غەفڵەتێکی قووڵە. بەرپرسیارێتییەکی گەورەی سەر شانی ئیمانداران و بەتایبەتیش قوتابیانی قورئان دوورکەوتنەوەیە لەم غەفڵەتە و ژیانە بەو شێوازەی بتوانرێت سەرفرازی دونیا و دواڕۆژ بەدەست بهێنرێت.

## خۆ بە گەورە زانین

خۆ بە گەورە زانین کە واتای بە کەم زانینی مرۆڤەکانیشی تێدایە، یەکێکە لەو سیفەتە بەدانەی کە خوای باڵادەست هیچ کاتێك حەزی

1. مسلم، السلام ٢٤؛ أبو داود، الأدب ٨٩.

پێ ناكات، جۆرێكە لە شێتی و نەخۆشی رۆحی كە بە رەنگدانەوەی دەرەكی خۆپەسەندی هەژمار دەكرێت، گەورەترین بەربەستیش لەبەردەم ئیماندا، بە داخەوە خۆ بە گەورە زانینە، بە درێژایی مێژوو زۆر مرۆڤ نەیانتوانی لەمپەری كیبر تێپەڕێنن و دان بە هیچیی خۆیاندا بنێن و بە بوونە یەكێك لە مرۆڤەكان شەرەفمەند بین، بۆیە دواجار ژیانیان بە نائومێدی كۆتایی هاتوون.

خۆ بە گەورە زانین سیفەتێكی بێباوەڕانەیە كە نابێت ئیماندار نزیكی هەرێمەكەی بكەوێتەوە، بەداخەوە لە بنچینەی زۆرێك لە نەخۆشییە مەعنەوییەكاندا كیبر و خۆ بە گەورە زانین بوونی هەیە. پێغەمبەری خوا ئاماژەی بە چوونە دۆزەخی مرۆڤە دڵڕەق و زاڵم و بێڕێز و خۆ پەرست و خۆ بە گەورە زانەكان كردووە[1]؛ هەروەها پێمان ڕادەگەیەنێت كە ئەو كەسەی هێندەی دانە خەردەلێك هەستی خۆ بە گەورە زانی تێدا بێت، بۆ نێو بەهەشت وەرنا گیرێت.[2]

عیززەت و عەزەمەت و گەورەیی ئەو سیفەتانەن كە تایبەتن بە خوای گەورە. یەزدانی مەزن مرۆڤە خۆ بە گەورە زانەكان شەرمەزار دەكات و فیزیان دەشكێنێت و چەندین سزای بە سۆی بۆ ئامادەكردوون.[3]

خۆ بە گەورە زانی تایبەتمەندیی مرۆڤانی وەك قارونە، كە بە ماڵ و سەروەتیاندا دەنازن. خوای گەورە ئیمانداران ئاگادار دەكاتەوە و دەفەرموێت:

---

١. البخاري، الإيمان ٩، تفسير السورة ١/٦٨، الأدب ٦١؛ مسلم، الجنة ٤٧.

٢. مسلم، الإيمان ١٤٧،١؛ أبو داود، الأدب ٢٩؛ الترمذي، البر ٦١.

٣. مسلم، البر ١٣٦.

﴿وَلَا تَمْشِ فِي ٱلْأَرْضِ مَرَحًا﴾ (الإسراء: ٣٧)

"بە فیزەوە بە سەر زەویدا مەڕۆ" و بە ئاشکراش پێمان ڕادەگەیەنێت کە هەرگیز مرۆڤە خۆپەسەند و خۆ بە گەورە زانەکانیشی خۆشناوێت.

کیبر کە نەخۆشییەکی هێندە زیانبەخشە، یەکێکیشە لە پاڵنەرە سەرەکییەکانی غەیبەت. مرۆڤی خۆ بە گەورە زان، کەسانی دی بە بچووک دەبینێت. لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا بە کەم ڕووانینی ئیمانداری بۆ براکەی بە خراپە هەژمار کردووە.[1] واتە گەر مرۆڤ هیچ گوناهێکیش نەکات بەڵام بە کەم بۆ برا ئاینییەکەی بڕوانێت و بە چاوی سووک تەماشای بکات، ئەوا ئەم ڕەفتارەی بەسە بۆ ئەوەی بۆی ببێتە گوناه. ناکرێت ئەم ڕەفتارە هەر وا ئاسان و سادە وەربگیرێت و چاوپۆشی لێ بکرێت. گاڵتەکردن بە هەڵە و کەموکورتیی ئیمانداران و باسکردنی لە هەموو شوێنێك و هەوڵدان بۆ نیشاندانی خود وەك بێ هەڵە و قسوور، لە لاوازییەکانی کەسانی گیرۆدەی خۆ بە گەورە زانییە. ئیماندارێکی کامڵ هیچ کات خۆی بە بەرزتر لە مرۆڤەکان نازانێت و هەڵە و کەموکورتیی مرۆڤەکانیش ناکاتە ویردی سەر زاری و نایانکاتە بابەتی گاڵتەجاڕی. کێ دەتوانێت نکوڵی ئەوە بکات ئەوەی گاڵتەی پێ دەکرێت لە ڕووانینی پەروەردگارەوە لەو کەسەی گاڵتەی پێ دەکات، پلەیەکی بەرزتری نییە!. شاعیر دەڵێت:

ئەهلی خەرابات بە کەم مەزانە
خەزنەی شاراوە وا لە کۆشکی وێرانە

---

١. الترمذی، البر ١٨.

بۆیە هیچ کەسێک نازانێت خۆشەویستی خوا لە دڵی کێدا بەهێزترە. جا پێویستە بەهای مرۆڤەکان بە پێی ڕووکەشیان یاخود پێگەیان دیاری نەکەین، بەڵکو بەهای مرۆڤ لە مرۆڤبوون و بەندایەتیی خوای گەورەدایە.

هەستی کیبر ئەو دوژمنە مەترسیدارەیە کە هەموو کات ڕەنگە ژیانی مەعنەوی مرۆڤ ژێرەوژوور بکات. پێویستە هەموو کات لە بەرامبەریدا لە ئامادەباشیدا بین و، هەر کە هەستمان پێی کرد هەنگاوی خێرا بۆ لەناوبردنی بنێین. حەزرەتی عومەر کاتێک وتاری دەدا ئەم هەستەی بەم جۆرە ڕەتکردەوە و لۆمەی خۆی کرد و پەنای بۆ خوا برد "ئەی عومەر! غروور نەتگرێت و بڵێیت من ئەمڕۆ خەلیفەی موسوڵمانانم. تۆ تا دوێنێش شوانی حوشتر بوویت". کەسێک هاتە خزمەت پێغەمبەری ئازیز و لە حزووریدا دەلەرزی، ئازیزمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) پێی فەرموو "مەترسە، بێزار مەبە! منیش وەک تۆ کوڕی ژنێکم دایکم نانەڕەقەی خواردووە" بەم شێوەیە نیشانی دان کە چۆن وەک مرۆڤێکی ئاسایی هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەن.

ڕاستییەکە ئەوەیە سەرکەوتن بەسەر لاوازییەکی وەک خۆ بە گەورە زانیندا، ڕێگرتنە لە چەندین نەخۆشی مەعنەوی کە لە نێویاندا غەیبەتیش هەیە. کەواتە هاوکێشەکە پێچەوانەیە، بەرزبوونەوە بە خاکی بوون و نزمبوونەوە بە خۆ بە گەورەزانینە. چەندە خاکی بین بین، لە دەرگای خوای گەورە و ڕوانینی مرۆڤەکانیشدا هێندە بەرز دەبینەوە.

لە هەمبەر ئەمەشدا چەندێك فیزاوی و خۆ بە گەورەزان بین هێندە نزم دەبینەوە و لە ئەرازووی حەق و خەڵکدا دەبینە کەسێکی بێ بەها و نزم.

ئەوەی دەیەوێت بگاتە خۆشەویستی ڕەحمان و مەحەببەتی خۆشەویستانی ڕەحمان، دەبێت خاکی بێت و لە خۆ بە گەورە زانین بە دوور بێت، وەك یەکێك لە مرۆڤەکان مامەڵە بکات و هەرگیز بە دەست یان بە زمانی ڕەفتارێك ئەنوێنێت بۆنی سووکایەتیکردنی بە کەسانی تری لێبێت.

## تاکتیکی ڕاکێشانی سەرنجەکان بەرەو لایەکی دی

وەك ئیمامی غەزالیش ئاماژەی پێ داوە یەکێك لە پاڵنەرەکانی غەیبەت بریتییە لەوەی پەنا بەریتە بەر باسکردنی کەموکوڕیی کەسانی دی بۆ ئەوەی کەموکوڕی خۆت باس نەکرێت. چەندە دۆخێکی بێمانا و بێزراوە کەسێك بچێتە سەر شانی یەکێکی دی بۆ ئەوەی باڵابەرز دەربکەوێت، بە هەمان شێوە هێندە ناشرینە کەسێك کەموکوڕی کەسێکی دی بکاتە قەڵغان بۆ خۆی.

هەندێك کەس کاتێك باسی قسووری خۆیان دەکرێت یان هەست بە ئەگەری باسکردنی دەکەن، بۆ بەرگریکردن کاردانەوەی بەرگری لەم جۆرە دەنوێنن "بەڵام فلانە کەسیش هەمان ئەو هەڵانە ئەنجام دەدات ئێوە وا دەڵێن بەڵام لە فلانە کەسیشدا فلان و فلان هەڵە بوونی هەیە". دەبێت

بزانین کە خراپ نابێتە نموونە و نموونەش لە خراپ ناهێنرێتەوە. گوناهـ خۆی لە خۆیدا گوناهە و هەر کەسێك ئەنجامی دابێت دوێنراوەکەی ئەو کەسەیە. لەبەر ئەوە وەك چۆن شەرمەزارییە کەموکوڕی و هەڵەی مرۆڤەکان بە چاویاندا بدرێتەوە، زۆر هەڵەیەو ناشرینە لەبەر ئەگەری ڕەخنە لێ گیران، ڕەخنە لە خەڵکی بگیرێت و غەیبەتی کەسانی دی بکرێت. کە خەڵکی هەڵە دەکات، مانای وا نییە ئێمەش دەتوانین ئەو هەڵەیە بکەین. جا باسکردنی بەرگی تۆزاوی کەسانی تر لە پێناو پاکراگرتنی خۆماندا، هەرگیز لەگەڵ ڕەوشتبەرزیی ئیسلامدا یەك ناگرێتەوە.

## بیرۆکەی بەرچاوخستنی خود

هەندێك کەس حەزدەکات کە لە مەجلیسێکدا بوو، باسی خۆی بکرێت. کە دەرفەتیشی بۆ ئەوە دەست نەکەوت دەست دەکاتە غەیبەت و باسکردنی خەڵك تا بەرزیی خۆی دەربخات. لەسەر قسووری خەڵکی خۆی نمایش دەکات و خۆی دەخاتە بەر سەرنج. بە وتنی "فڵان ئاوایە، فیسار ئاوایە"، هەوڵ دەدات ئەوە بباتە مێشکی ئامادەبووانەوە کە خۆی وا نییە و، خۆی فڵان و فڵان شایستەیی و لێهاتنی هەیە.

ڕەفتاری لەم جۆرەش وەك هۆکارەکانی تری غەیبەت، دەرکەوتەی بۆشاییەکی مەعنەوییە. ئەوەی دڵی لە خولگەی ئیخلاسدا

دەسووڕێنێتەوە، گرنگی بە "توجه الناس" نادات؛ بە چەپڵەی خەڵکی هەڵناخەڵەتێت. ئەم بایەخ و چەپڵەڕێزان و بەرزنرخاندنانە وەك ئاگرێك بە پووش بکرێتەوە ڕاگوزەر و تێپەڕە و وەك کەفی سەر دەریا نمایشی بێمانا و ناو بۆشە. ئەوەش کە جێگیر و هەمیشەییە، ڕەزامەندی خوای گەورەیە. ئەو گەورەترین مەبەست و داواکراوە. هەموو شتێکیش بەدەر لەو بۆسەی خەڵەتێنەر و پێ خزێنەرە. پیاوی ژیر و بە شکۆ ئەو زومڕووت و ئاڵتوونانەی لە داهاتوودا پێی دەدرێت، بە بەردو گەردی سەر ڕێگا ناگۆڕێتەوە. دان بە خۆیدا دەگرێ و بۆ ئەوەی کۆتایی کامەرانی دەستیکەوێت، بە ئومێدی ئەوەی سەرەنجامی بە ڕەزامەندیی خوایی کۆتایی بێت، هەوڵ دەدات ژیانی هەمیشە لە سەر تەوەرەی ڕەزامەندیی ئەو بەسەر بەرێت.

## بەهانەی کات بەسەربردن

یەکێك لەو ڕێگا هەڵانەی مرۆڤ بەرەو غەیبەت دەداتە بەر ئەوەیە بە بەهانەی کات بەسەربردن لاسایی خەڵکی بکرێتەوە و کەموکورتی و هەڵەیان بکرێتە بنێشتە خۆشەی سەر زار.

بە بچووك تەماشاکردنی هەر مرۆڤێك لەبەر کۆمەڵێك کەموکوڕی یاخود گاڵتەپێکردنی لەبەر ناتەواوییەك و غەیبەت کردن بۆ بەسەربردنی کاتێکی خۆش، تا ئەوپەڕی بێ حورمەتییە و کردەوەیەکی تا بڵێی ناپاکانەیە. ئەم جۆرە هەڵسووکەوتانەش بە داخەوە لە لاوازی ئیمانەوە

سەرچاوە دەگرێت، بە هەر هۆکارێک بێت دەردی پێکەنین و گاڵتەجاڕی بە دونیای ئێمە نامۆیە و لە تێگەیشتنی ئەخلاقیماندا شوێنی نییە، دەبێت رێگە نەدەین ئەم جۆرە نەخۆشییانە دزە بکەنە نێو کۆڕەکانمانەوە و پێویستە ئەو هۆکارانەی خۆشیکردن بهێنینە مەیدان کە شوێنکەوتەی ڕەزامەندی پەروەردگارن، هەرگیز لە کۆڕی یادی خوا و تاوتوێکردنی مەفکوورە باڵاکاندا کات بەسەربردن بە هەڵە و کەموکوڕی خەڵکی شوێنی نابێتەوە. ڕەوشتی ئیسلام، کاتی هۆش وەک سەرمایەیەکی گرنگ دەبینێت و چاوەڕێ دەکات مرۆڤەکان سوپاسگوزاریی ئەم بەخششە پڕ بەهایە دەربڕن. لە بری ئەوەی کاتە هۆشەکانمان بە غەیبەت کردن و پێکەنینی بێهوودەوە بەسەر بەرین؛ دەبێت بۆ زانست و یادی خوا و کتێب خوێندنەوە و گوێگرتن لە گفتوگۆی پڕبایەخ سوودیان لێ ببینین. لە یادتان نەچێت، یەکێک لەو خاڵانەی لە بەرامبەر خوای گەورەدا لێی بەرپرسیار دەبین بریتییە لە چۆنێتی بەسەربردنی سەرمایەی تەمەنمان.

تا ئێرە تیشکمان خستە سەر هۆکارەکانی غەیبەت و هەوڵمان دا چەند ڕێنوێنییەک بۆ زاڵبوون بەسەر ئەم هۆکارانەدا بخەینە ڕوو. بێجگە لەم ڕێنوێنییانە، یەکێک لەو بابەتانەی پێویستە ئاماژەی پێ بدەین بریتییە لە پێویستی دووربوونمان لە گوناهـ و ئەو کەش و شوێنانەی ڕەنگە بەرەو گوناهـ بمانبەن. چۆن هەوڵ دەدەین خۆمان لە زینا بە دوور بگرین و دەممان بۆ خواردنەوە نەبەین، پێویستە زمانیشمان لە غەیبەت داببڕێنین. دەبێت خاوێنی زمانمان بپارێزین و ئاگامان لێی بێت. جارێکیان حەزرەتی عیسا (عَلَیْهِ السَّلَام) لەسەر ڕێگاکەی پیاوخراپێکی بینی و پێی فەرموو "دەی! بە سەلامەتی بڕۆیت." ئەوانەی چواردەوری وتیان "ئاوا قسە

لەگەڵ پیاوخراپێکدا دەکەیت؟" ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی "من لەوە دەترسم زمانم لەسەر گوفتار و قسەکردنی خراپ ڕابێت."

هەرچییەك بڵێین و هەرچی بکەین، دەبێت هەمیشە ئەو ڕاستییەمان لە یاد بێت کە خوای گەورە لێی خەبەرداره.

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ۖ مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَا أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَا أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا ۖ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۚ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾

(المجادلة: ٧)

"نابینی کە خوا چی لە ئاسمان و چی لە زەویدا بێت دەیزانێت! سێ کەس پێکەوە بە دزییەوە چپە چپ بکەن، چوارەمیان خوایە. پێنج کەس بە نهێنی قسە بکەن، بێگومان شەشەمیان خوایە. حەز دەکەی با لەمە زیاتر بن یان کەمتر، لە هەر شوێنێك بن، بێگومان ئەو لەگەڵیاندایە. ئەو، دواجار لە دواڕۆژدا یەك بە یەکی ئەو شتانەیان دێنێتەوە بەرچاو کە کردوویانە، گەر بیەوێت بەرپەرچیان دەداتەوە. بێگومان خوای گەورە بە هەموو شتێك زانایە."

وەك لەم ئایەتە پیرۆزەدا هاتووە جەنابی اللّٰه هەردەم لەگەڵ ئێمەدایە. لە ڕۆژی قیامەتیشدا ئەو دەفتەرانەمان دەخرێتە پێش چاو کە هەموو شتێکیان تێدا تۆمار کراوە، ڕووبەڕووی کردار و گوفتارەکانمان دەکرێینەوە و لێیان بەرپرسیار دەبین.

بابەتێکی زۆر گرنگ کە پێویستە تیشکی بخەینە سەر بریتییە لە ڕێ خۆش نەکردن بۆ غەیبەت لە کۆبوونەوە و ڕاوێژەکاندا. هەرچییەك

بێت و لە هەر جۆرە بەرگێکی بێتاوانیدا بێت، غەیبەت هەر غەیبەتە. گەر بڕیار بێت دەربارەی کەسێك بدوێین، دەبێت بێ ئەوەی نەفسمان تێکەڵاوی بابەتەکە بکەین، لەسەر بنەمای پێوانەی حەقدۆستانە بڕیاری لەسەر بدەین؛ پێویستە لە سەرەتادا باسی فەزیلەتەکانی ئەو کەسە بکەین، جوانی و خزمەتەکانی بخەینە ڕوو. زۆر ناشرین دەبێت لە کاتی تاوتوێ کردنی بابەتەکەدا غەیبەت و قسەی زبر بخزێنینە نێوەندەوە. خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ (النساء: ١١٤)

"زۆربەی ئەو دانیشتن و چرپەچرپەی ئەوان ئەنجامی دەدەن، خێردار نییە. بۆ ئەوەی ئەم یەکتربینینانەیان خێردار بێت پێویستە یارمەتی هەژاران بدەن یان ڕەفتارێکی جوان بەرجەستە بکەن یاخود نێوانی ئەوانە چاك بکەنەوە کە لە یەکدی عاجزن. ئەوەی ئەمە لە پێناو ڕەزامەندی خوادا ئەنجام بدات، ئێمە پاداشتی زۆر گەورەی دەدەینەوە."

بۆیە دەبێت لە خولگەی کۆڕی ڕاوێژدا ڕەزامەندی خوای گەورە بوونی هەبێت و تێیدا غەیبەت تەنانەت بە خەیاڵیشدا نەهێنرێت. لە سوننەتی نازیزیشماندا ئەم ڕاستییە دووتپات کراوەتەوە.

سزادانی نەفس یەکێکە لە ڕێگاکانی ڕێ گرتن لە غەیبەت و هەنگاونان بۆ ڕزگاربوون لەم نەخۆشی یە. بۆ نموونە دەکرێت لە هەر غەیبەت کردنێکدا سزایەکی وەك سەدەقە بەخشین یاخود ڕۆژوو گرتن جێبەجێ بکەین، ڕەنگە لە ئەنجامی ئەم سزایانەدا نەفسمان بە ئاگا بێتەوە و، خۆی تەسلیمی عەقڵ بکات و پاش ماوەیەك غەیبەت نەکردن ببێتە بەشێك لە سروشتمان. لەناو زانایانی ئیسلامدا کەسانێك وەك عەبدوڵڵای کوڕی وەهب هەبوون کە لە بەرامبەر غەیبەتی هەرکەسێکەوە ڕۆژێك ڕۆژوویان لەسەر خۆیان فەرز کردووە، کاتێکیش بینیویانە هێشتا بەسەر ئەم حاڵەیاندا زاڵ نەبوون، کردوویانەتە عادەت کە لە بەرامبەر هەر غەیبەتێکەوە یەک درهەم وەك خێر ببەخشن، تا دواجار توانیویانە نێوانیان لەگەڵ غەیبەتدا بپچڕن و لێی دوور بکەونەوە.

پاش ئەوەی ئیمامی زەهەبی ئەم ململانێیەی عەبدوڵڵای کوڕی وەهبمان بۆ باس دەکات، دەڵێت "سوێند بە خوا زاناکان پیاوی وەها بوون، ئەم ڕەفتارانەشیان هیچ نەبوو جگە لە بروبومی زانستی بەسوود."[1] بەم جۆرە لە لایەك سەرسوڕمان و لە لایەکی تریشەوە نرخشناسی خۆی دەردەخات.

یەکێکی تر لە دۆستانی حەق پێمان دەڵێت کە لەم ڕێگەیەدا ڕەچەتەیەك پەیڕەو دەکات و لە بری غەیبەتێك خۆی مەحکوومی سێ مانگ ڕۆژووگرتن دەکات.[2]

---

١. الذهبي ، سير الأعلام النبلاء ٢٢٨/٩.

٢. مەحەمەدوڵڵا گولەن، لەبەشێکەوە بۆ بەشێکی تر.

مرۆڤ بێ هەڵە نابێت. ئەوەی بە دوای هاوڕێ و دۆستی بێ کەموکوڕدا بگەڕێت، بێ دۆست دەمێنێتەوە. قبوولکردنی مرۆڤەکان بە هەڵە و کەموکوڕییەکانیانەوە، نیشانەی پێگەیشتووییە. ئەمەش بە واتای ئەوە نایەت ئێمە هەڵە و قسووریی مرۆڤەکان وەك خۆی قەبووڵ بکەین و هیچ بیر لە چاککردنیان نەکەینەوە. هەڵە هەیە دەتوانرێت چارەسەر بکرێت، هەیە ناتوانرێت چارە بکرێت. بێگومان دەتوانرێت هەندێك لاوازی و هەڵەی سەر بە ڕەوشتی خراپ ڕاست بکرێتەوە، بەڵام ئەوەی تەقدیری خوا و کەموکوڕی جەستەییە، چاککردنی ئەستەمە. دەبێت ئەمانە وەك تەقدیری خوای گەورە ببینین و بە تایبەتیش سوپاسی بکەین بۆ دووربوونمان لەو ناڕێکی و نەخۆشییانە. لە لایەکی ترەوە، دەبێت هەوڵ بدەین بە ئوسلوب و ڕێگای گونجاو ئەو هەڵانە چارەسەر بکەین کە دەکرێت چارە بکرێن، هەروەها پێویستە خۆمان لەو غەیبەت و تسەڵۆکانە بەدوور بگرین کە بێهوودەن و کار لە ئەنجامەکە ناکەن. دەبێت ئەوەش بزانین کە غەیبەت هەڵسوکەوتێکی هێندە شرێتانەیە وەك ئەوە وایە لە لایەکەوە گۆزەی کردەوە چاکەکان لە ئاوی سازگاری چاکە پڕ بکرێت و لەلایەکی تریشەوە بنی گۆزەکە بشکێنرێت و دەیان کردەوەی جوان بە هەدەر بدرێت و بڕژێنرێت. ئەم گوناهە ئەو کردەوە چاکانە کەم دەکاتەوە کە بەندە لە ڕێگەی خوادا ئەنجامی دەدات. دەبێت ئاگادار بین و بەرامبەر غەیبەت لە ئامادەباشیدا بین و گوڵی دەربڕین کە "زمان"ە وەك یەکێك لە گەورەترین بەخششەکانی یەزدانی مەزن تێکەڵ بە پیسییەکانی وەك غەیبەت و قسەی پاشەملە و قسە هێنان و بردن و درۆ نەکەین. ئەوەی دەیەوێت لە بەهەشت نزیك و لە دۆزەخ دوور بێت،

ئەوا با ئاگای لەو بەرهەمانە بێت کە لە کارخانەی زوباندا بەرهەمیان دەهێنێت، ئەوانەی بە ڕاستی باوەڕ بە خوا و بە ڕۆژی دوایی دەکەن، با زمانیان یان بۆ خێر بەکاربهێنن، یان بێدەنگی هەڵبژێرن، وە سەلام...

# سزا دونیایی و دوارۆژییەکانی غەیبەت



"سوێند بە خوا غەیبەت زۆر زیاتر لە زیانی برینێکی ڕەش بووەوە بۆ جەستە، زیان بە ئاینی ئیماندار دەگەیەنێت".

حەسەن بەسری (رضيَ اللهُ عَنْهُ)

## سزا کەسی و کۆمەڵایەتییەکانی غەیبەت

غەیبەت لە زۆر لایەنەوە هەڕەشەیە بۆ سەر ئیماندار و دەبێتە مایەی زیانی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی و دوارۆژی. ئەو پێش هەموو شتێک زیان لە پایە و پێگەی مرۆڤ دەدات. چونکە مرۆڤەکان پاش ماوەیەک بە چاوێکی جیاواز لەو کەسە دەڕوانن کە زمانی بە غەیبەت ڕاهێناوە. ئەو کەسەی بەردەوام لە پشتەوە باسی خەڵکی دەکات و لەبەر چاو ڕەشیان دەکات، لە زیهنی مرۆڤەکاندا لە پێگەیەکی ڕێزداردا نییە، لە

وێنایەکی هەرزان و نزمدایە. چونکە پاش ماوەیەك مرۆڤەکان لە دڵی خۆیاندا دەڵێن "کێ دەزانێت، ڕەنگە لە غیابی ئێمەدا غەیبەتی ئێمەش بکات!"، بەم جۆرە هەستی ڕێز و حورمەتیان بەرامبەر ئەو کەسە تووشی داخوران دەبێت.

خاڵی داهاتووی ئەم ئاستەش بریتییە لە ڕووخان و بەر باد بوونی هەستی برایەتی. چونکە غەیبەت ئەو هەستی متمانەیە دەکوژێت کە پێویستە لە نێوان ئیمانداراندا هەبێت. ئیمانداران بران و دەبێت وەك براش مامەڵە بکەن. برا بە چاوی کەم لە براکەی ناڕوانێت، لە پشتییەوە قسەی پێ ناڵێت، پیلانگێڕی لە دژی ناکات. گەر دۆخەکە پێچەوانە بوو، ئەوا ناکرێت باسی برایەتی بکەین. کۆمەڵگایەکی وەها بە کۆمەڵگای برایەتی ناو نابرێت، بەڵکو گونجاوترە بە کۆمەڵگەی ئەو دووپشکانە بناسرێت کە بۆ ژەهراویکردنی یەکدی لە بۆسەدان.

خوای گەورە حەز دەکات ئیمانداران وەك یەك جەستە بژین، هێندە لە نێو یەکتردا فەنا بن بە جۆرێك ئەم هەستە پەی بە قووڵترین جێگاکانی نێو ناخیان ببات. برایەتی یەکێکە لەو تایبەتمەندییانەی کە لە ژیانی ئیمانداراندا خاڵی چەقی داگیر کردووە. مامۆستا بەدیعوززەمان بە تایبەت سەرنجمان بۆ گرنگی برایەتی لە نێو ژیانی قودسییەکانی ئاخر زەماندا ڕادەکێشێت "بناغەی پیشەکەمان برایەتییە... لەبەر ئەوەی پیشەکەمان "الخليلية" یە، مەشرەبمان "خولة" ە. خوللەتیش داخوازی نزیکترین دۆست و فیداکارترین هاودەم و چاکترین هاوڕێی پاڵپشت و جوامێرترین برایە."[1] لە ڕاستیدا خۆی لە بابەتی غەیبەت و درۆدا تا بڵێی

١. بەدیعوززەمان سەعید نوورسی، تیشکەکان، تیشکی ٢١.

هەستیار بوو. گەر بیانوتایە "فلانە کەس وای وتووە"، ئەو دەیوت "ئێوە بە هەڵە حاڵی بوون، ئەو کەسە دۆستی منە. ئەو دۆستی پەیامەکانی نوورە. ئەو وا ناڵێت. ئێوە نێوانی من و براکەم تێك دەدەن."، وای دەوت و هەرگیز ڕێگەی بە غەیبەت نەدەدا. هەردەم هەوڵی دەدا ڕوونکردنەوەی باش لەسەر ئەم جۆرە سکاڵایانە بدات و دەیوت "ئێمە فەرمانمان بە گومانباشی پێ کراوە". کە دوو دەستەش سکاڵایان لە یەکدی دەکرد، جەختی لەسەر برایەتی دەکردەوە و پێی دەوتن "براکەم، ئێوە زیاد لە خزمەتەکەتان، پێویستتان بە هەماهەنگی هەیە. پێویستە ئێوە لە نێو خۆتاندا ناو بە ناو "پەیامەکانی ئیخلاس و برایەتی" و "شەش هێرشەکە" بخوێننەوە. ئەو خۆڕاگری و کۆڵنەدان و هەماهەنگیە باڵایەی ئێوە بەرجەستەی دەکەن، دەبێتە مایەی شانازی ئەم نیشتیمانە."

برایەتی، یەکەمین پلەی ئەو پلیکانەیەیە کە بەرەو سەرکەوتن دەڕوات، ئەو شوێنەی برایەتی لێ نەبێت یەکبوون و هەماهەنگیشی لێ نابێت. ئەو شوێنەش یەکبوون و هاوئاهەنگی لێ نەبێت، سەرکەوتنیشی تێدا بەدەست نایەت. موحەممەد عاکیفی شاعیر لە ناڵەی شاعیرانەیدا سەرنجمان بۆ گرنگی پەیوەندی پتەوی نێو ئیمانداران ڕادەکێشێت و دەڵێت "گەر دڵەکان پێکەوە لێبدەن، گوللەی تۆپیش ڕایان ناگرێت".

بەڵێ، لە پشت هەموو سەرکەوتنە مەزنەکانەوە، ڕۆحی پێکەوە کارکردن و کەشی برایەتی وەك هێزی پاڵنەر بەدی دەکرێت. ئەستەمە ئەوانەی چاڵ بۆ یەکتر هەڵدەکەنن و لە یەکدی دەخوێنن، بتوانن سەرکەوتنی هەمیشەیی دەست بخەن. پێویستە ئیمانداران سەرەتا پەیوەندییەکی

برایەتی نموونەیی لە نێوانیاندا بهێننە کایەوە، پاشان خۆیان بە دوور بگرن لەو شتانەی مەترسین بۆ سەر ئەم برایەتییە. یەکێك لە گەورەترین ئەو مەترسییانەی هەڕەشەن بۆ سەر یەکبوونی ئەوان، غەیبەتە. غەیبەت وەك بۆمبێك وایە لە بناغەی باڵەخانەی برایەتیدا جێگیر کرابێت و مەترسی ئەوەی هەیە باڵەخانەی گەورەی ئیسلام یەکسانی خاك بکات. دەبێت هەموو ئیماندارێك لە هەمبەر دوژمنێکی وادا کە بونیادی کۆمەڵایەتی بەم ڕاددەیە دەخاتە مەترسییەوە، لە ئامادەباشیدا بێت و هەرگیز فەرمووی لێ نەکاتە نێو کەشی ئاسوودەیی کۆمەڵگاوە.

لە لایەکی دیکەوە نەخۆشی غەیبەت کە بەردەوام لە بڵاوبوونەوەدایە، پاش ماوەیەك دەبێتە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی. وای لێدێت هەمووان گومان لە یەکدی دەکەن. کۆمەڵگایەك بەم هەستانەوە بژی، چاوەڕێی ئەوەی لێ ناکرێت بڕیاری ڕاست بدات و هەنگاوی دروست بنێت. بۆ ئەوەی نەکەوینە دۆخێکی وەهاوە، پێویستە لێی دوور بین و بەردەوام لە بەرامبەریدا کاردانەوەی بەرگریمان هەبێت. کاریگەرییەکی ڕووخێنەری غەیبەت بریتییە لە پوکاندنەوەی هەستی گومانباشی و هێنانەوەی نەخۆشی بەدگومانی. جارێکیان حەزرەتی عیسا (عَلَیْهِ السَّلَام) و حەوارییەکانی بە لای لاکی تۆپیوی سەگێکدا ڕەت دەبوون. حەوارییەکان فەرموویان "چەندە بۆنێکی ناخۆشی لێدێت!"، حەزرەتی عیساش (عَلَیْهِ السَّلَام) دەفەرموێ "ددانەکانی چەندە سپین!"، بەم جۆرە وانەیەکی پەند ئامێزی بە قوتابییەکانی وتەوە تا جوان ببینن و جوان بیر بکەنەوە. لە هەمان کاتدا دەتوانین بڵێین لەو گۆشەنیگایەی ئەوەوە تەنانەت نابێت غەیبەتی ئاژەڵانیش بکرێت. بەدیعوززەمان ئەم ڕاستییە دێنێتە سەر

زار و دەفەرمویێت "ئەوەی جوان ببینێت، جوان بیر دەکاتەوە. ئەوەش جوان بیر بکاتەوە، چێژ لە ژیان وەردەگرێت"[1] بەم جۆرە هەوڵ دەدات گۆشەنیگای ئەرێنی بە ئیمانداران ببەخشێت. ئیمانداران ئەو مرۆڤانەن کە پۆزەتیڤانە تەماشای ژیان دەکەن و هەوڵ دەدەن بۆ بەشی پڕی پەرداخەکە بڕوانن. غەیبەت زیانێکی زۆر بەم گۆشەنیگا پۆزەتیڤەی ئەوان دەگەیەنێت و زەمینە بۆ بەرەوپێش چوون و نەشونما کردنی هەستی بەدگومانی ئامادە دەکات.

غەیبەت لە ڕووانگەی پەیوەندی نێوان بەندە و خواوە کاریگەریی نەرێنی هەیە. غەیبەت بریتییە لە لەکەدارکردنی شکۆ و شەرەفی مرۆڤێك و بچووککرنەوەی ئەو کەسە لەبەر چاوی مرۆڤەکان. ئەو کەسەی غەیبەت دەکات بەم واتایە بە پێچەوانەی مەبەستەکەیەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت. لە کاتێکدا ئەم نیەتی سووك کردن و بچوك کردنەوەی ئەو کەسەیە، کەچی خۆی لە لای خوای گەورەدا بچووك دەبێتەوە. وا هەست دەکات کەسێکی بچوك کردووەتەوە، ئەو هەژارە نازانێت خۆی بەرەو بیرێکی بێ بن تلۆر کردووەتەوە. لە کاتێکدا هەوڵدەدات قوڕ بگرێتە کەسانی تر، کەچی خۆی لە ناوەڕاستی زەلکاوەکەدا گیری خواردووە.

---

1. بەدیعوززەمان سەعید نوورسی، مەکتوبات، تۆوەکانی حەقیقەت.

## سزا دوارۆژییەکانی غەیبەت

غەیبەت لەگەڵ زیانە کەسی و کۆمەڵایەتییەکانیدا، لە دوارۆژدا لە شێوەی سزای جیا جیادا دێتەوە بەردەم مرۆڤ. لەم بابەتەدا پێغەمبەری خوا چەند هەواڵێکی پێ داوین. پێغەمبەری ئازیزمان لە گەشتی میعراجیدا کۆمەڵێك مرۆڤی بینی کە بە نینۆکە مسەکانیان دەموچاو و سنگیان دەڕنی، لە حەزرەتی جوبرەئیلی پرسی ئەمانە کێن. ئەویش لە وەڵامدا هەواڵی ئەوەی پێدا کە ئەوانە ئەو مرۆڤانەن کە بە غەیبەت کردن گۆشتی مرۆڤەکان دەخۆن و باسی نابەجێیی شەرەف و ناموسیان دەکەن.[1]

پێغەمبەری خوا (عَلَيۡهِ ٱلۡفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لە شەوی میعراجدا گەشتێکی تایبەتیی کرد و بە ڕابەرایەتی حەزرەتی جوبرەئیل نهێنیگەلێکی زۆری بۆ دەرکەوت. یەکێك لەو تابلۆیانەی لەو شەوەدا بینی، بریتیبوو لە سەرەنجامی ئەوانەی غەیبەت دەکەن. ئەوانەی گوناهی غەیبەت کردنیان لە ئەستۆدایە لە دوارۆژدا بە پەنجەی مسین دەموچاو و سنگیان دەڕنن و بەم جۆرە لە نێو خوێندا دەگەوزێن.

بە پێی ڕیوایەتێکی لاواز ڕۆژێك پێغەمبەری خوا (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ) ئەم ئامۆژگارییانەی موعازی کوڕی جەبەل دەکات "ئەی موعاز! خوای تەعالا پێش دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی حەوت فریشتەی دروست کردووە؛ پاش دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویش هەر یەکێك لەوانی وەك دەرگاوانی یەکێك لە ئاسمانەکان داناوە. ئەم فریشتانەش هەر یەکە

---

1. أبو داود، الأدب ٣٥.

لەو ئاسمانەدا کە لێی بەرپرسیاربوو، شایەتی دەدا لەسەر درەوشانەوەی جەلال و عەزەمەتی خوای گەورە. ئەو فریشتانەی کردەوە تۆمار دەکەن، کردەوەکانی مرۆڤ کە لە بەیانییەوە تا ئێوارە ئەنجامیداون و وەك تیشکی خۆر دەدرەوشێنەوە، هەڵدەگرن و بەرەو ئاسمان بەرزیان دەکەنەوە. کاتێك فریشتەکان دەگەنە ئاسمانی دونیا لە مەقامی سەنای کردەوەکانی ئەو بەندەیەدا دەڵێن "چەندە کردەوەی زۆرە!" و پێیدا هەڵدەدەن. بەڵام فریشتەی فەرمانبەر دەڵێت "ئەم کردەوەیە بدەنەوە بە چاوی خاوەنەکەیدا. من فریشتەی ئەو کەسەم کە غەیبەتی کراوە. خوای گەورە فەرمانی پێ کردم کردەوەی کەسێك نەگەیەنم کە غەیبەتی مرۆڤەکانی کردبێت!"[1]،

بەم جۆرە ڕێگە نادات ئەو کردەوەیە بخرێتە خزمەت خوای تەعالا."

دیسان بە پێی ئەو هەواڵەی حەزرەتی بەرڕاء دەیدات، پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پاش نوێژی نیوەڕۆیەك هێندە تووڕە بووبوو تەنانەت کچانی لاوی نێو ماڵەکانیش دەنگیان دەبیست. سەردارمان ئەو ڕۆژە بە خەڵکەکەی فەرموو "ئەی ئەو خەڵکەی بە زمان ئیمانتان هێناوە و دڵتان نەگەیشتووەتە ڕاستی ئیمان! غەیبەتی موسوڵمانان مەکەن؛ مەکەونە دوای هەڵە و کەموکوڕی ئەوان! هەر کەسێك بکەوێتە گەڕان بە دوای کەموکوڕی و ڕازی براکەیدا، خوای گەورەش کەموکوڕی و ڕازی ئەو ئاشکرا دەکات، بە جۆرێك لە ناوەڕاستی ماڵی خۆیدا شەرمەزار و ڕیسوای دەکات."[2]

ڕۆژێکیان کەسێکیان هێنایە لای ئیبن مەسعود (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) و وتیان

1. المنذري، الترغيب والترهيب ٣٨/١.
2. أحمد بن حنبل، المسند ٤٢٤/٤؛ الطبراني، معجم الأوسط ٢٠٧/٣؛ ١٢٥/٤.

"ئەمە فڵانە کەسە کە شەراب لە ڕیشی دەچۆڕێت." ئیبن مەسعود ئەم قسەیەی بەلاوە خۆش نەبوو و پێی وتن "گەڕان بە دوای لایەنی شاراوەی خەڵکی و سیخوڕی کردن لەو بارەیەوە کاری ئێمە نییە. ئەگەر تاوانێکی ئاشکرا لە ئارادا بێت، ئەوەی پێویست بێت ئەنجامی دەدەین."[1]

بەڵێ، هاوەڵانی ئازیز بە باشی وانەیان وەرگرتبوو. بەدواداچوونی دۆخی شاراوەی مرۆڤەکان و دەرخستنی کەموکووڕیی و قسووریی مرۆڤەکان واتای هەڵسوکەوتی پێچەوانەی ناوی "الستار" ی خوای گەورەی دەگەیاند. خوای گەورە نەیدەویست ئیمانداران ببنە ڕاوچی ئەنگی مرۆڤەکان. گەر ببوایە و هەڵەیەك یان گوناهێك ڕوون و ئاشکرا ئەنجام درابایە، لایەنی بەرپرس مامەڵەی پێویستی لەگەڵدا دەکرد. لە دەرەوەی ئەمە بەدواداچوونی دۆخی شاراوەی مرۆڤەکان و چاوبڕینە حەرەمەکانیان لەگەڵ ڕەوشتی ئیسلامدا یەك ناگرێتەوە. ئەوانەی پێچەوانەی ئەم دەستوورە دەجووڵێنەوە، خوای گەورە هەڕەشەیان لێ دەکات کە لە نێو ماڵی خۆیاندا و لە بەردەم هەمووواندا ڕیسوایان دەکات. بۆیە دەرخستنی هەڵە و گوناهی مرۆڤەکان و باسکردنیان هەڵەیەکی گەورەیە و دەبێتە مایەی تووڕەیی خوای گەورە. ئەوانەی بەم جۆرەش مامەڵە دەکەن، ئەنجامی کردەوەکانیان دێتەوە ڕێیان.

حەزرەتی جابیر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) یادگارییەکی خۆی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بەم جۆرە دەگێڕێتەوە "ڕۆژێکیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا پێکەوە دەڕۆیشتین گەیشتینە سەر دوو گۆڕ و فەرمووی کە ئەوانەی لە نێو ئەم

---

١. أبو داود، الأدب ٣٧.

دوو گۆڕەدان سزا دەدرێن. پاشان بەدەم گریانەوە فەرمووی "ئەمانە لەبەر ئەنجامدانی گوناهی گەورە سزا نادرێن. یەکێکیان خۆی لە میزکردن پاک نەکردووەتەوە و ئەوی دیشیان غەیبەتی مرۆڤەکانی کردووە." پاشان داوای کرد یەک (یان دوو) گەڵای درێژی خورما بهێنن. کردنی بە پارچەی بچووک بچووکەوە و لە قەبرەکاندا چاندنی. لە پاش ئەوە فەرمووی "ئەمانە تا ئەو کاتەی وشک دەبن، سزاکەیان سوک دەکەن"[1]

شانازی مرۆڤایەتی ئەم ڕێنوێنییەی حەزرەتی مەیمونەی دایکمان دەکات "ئەی مەیمونە! پەنا بگرە بە خوا لە سزای نێو گۆڕ! دوو شت کە لە قیامەتدا دەبنە هۆکاری سزای زۆر سەخت، غەیبەت و هەستیار نەبوونە بەرامبەر پرژ و پیسی میز."[2]

هاوتەریب لەگەڵ ئەم فەرموودانەدا، حەزرەتی قەتادە سێیەکی سزای گۆڕ بۆ غەیبەت و سێیەکی دیکەی بۆ هەستیار نەبووم لە کاتی میزکردن و سێیەکەکەی دیکەشی بۆ قسە هێنان و بردن لە نێوان مرۆڤەکان دەگەڕێنێتەوە.[3]

سەردارمان (عَلَيۡهِ أَفۡضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) زۆر ئاسایی لە ڕێی خوای گەورەوە زانابوو بە دۆخی ئەهلی گۆڕستان. دەیزانی خاوەنی گۆڕەکان بۆچی سزا دەکێشن و یاخود ڕەحمەتیان بەسەردا دەبارێت. بێگومان شتێکی تا بڵێیت ئاساییە ئەو کەسەی کە کلیل بە دەستی زۆرێک لە نهێنییەکانی جیهانی "ملك" و "ملكوت"ە، خەبەرداری حاڵی دوو تەرم بێت. ئەو

---

١. ابو اليعلى، المسند ٤٣/٤.
٢. علي المتقي، كنز العمال ٢٣٧/٣.
٣. علي المتقي، كنز العمال ١٠٧/١٦.

ڕۆژە کە بە لای گۆڕەکاندا تێپەڕی، دیمەنی سزای لە هەردووکیاندا بینی. بینی و لە پێناو بانگەواز و گەیاندندا هەواڵی دایە هاوڕێکانی.

بە بڕوای ئێمە سزای گۆڕ هەقە و ڕاستییە. مرۆڤ لەبەر ئەو هەڵانەی لە دونیادا کردوونی، دەکرێت لە گۆڕەکەیدا ناڕەحەتی بچێژێت. بەڵام عەقڵ لە توانایدا نییە لەمەڕ شێواز و چۆنێتی ئەمە هیچ بڵێت. ئێمە ڕاستی سزای گۆڕ قەبووڵ دەکەین بەڵام کە دێتە سەر چۆنێتییەکەی، تەسلیم دەبین و ئیمان دەهێنین. زانایەکی ئیسلام دەڵێت "گەر سەرجەم بەرهەمەکانی ئەمرۆی زانست و هەموو تواناکانی تەکنەلۆژیا و ئەزموونەکانی مێژووی مرۆڤایەتی کۆ بکەینەوە، هێشتا ناتوانین دەربارەی پەیوەندی نێوان ڕۆح و جەستە هیچ بڵێین. چ جای بڕۆین هەڵسەنگاندن بۆ جیهانی بەرزەخ بکەین؟"[1] بەم شێوەیە دان بەوەدا دەنێت کە لە بەرامبەر دۆزینەوەی ڕاستی ئەمەدا دەستەوەستانین.

جیهانی گۆڕ کە یەکەم وێستگەی ڕێگەی دواڕۆژە، وەك کلیلێك وەهایە. چونکە لە جیهانی گۆڕەوە دەردەکەوێت کە ئەنجامی بەندەیەك بە چی دەگات. گەر ئەنجامەکە خێردار بێت ئەوا کەم تا زۆر ژیانی گۆڕیش ئاسوودە دەبێت؛ گەر ئەنجامەکەش نەرێنی بێت ئەوا گۆڕ دەبێتە پێخەفێکی ئەشکەنجە و جەفا بۆ خاوەنەکەی. "وەك چۆن ژیانی دونیا بە گوێرەی ژیانی گۆڕ وەك خەونێکە؛ بە هەمان شێوە ژیانی گۆڕیش بە گوێرەی ژیانی جیهانی دواڕۆژ وەك خەونێکە. دەکرێت مرۆڤە لە خەونیدا دوچاری سزایەك ببێتەوە. سزای گۆڕیش بە گوێرەی سزای

---

١. م.فەتحوڵلا گولەن، لە بەشێکەوە بۆ بەشێکی تر.

دۆزەخ وەك سزای نێو خەوی کەسێکی خەوتووە بە گوێرەی سزای کاتی بەئاگابوونی."، وەك لەم گوزارشتانەدا هاتووە جیهانی گۆڕ دیونکی تەواو جیاوازە. (خوای گەورە گۆڕی هەمووومان بکاتە گوڵشەنێك لە باخەکانی بەهەشت!)

ئەو دوو کەسە بۆچی سزایان دەچەشت؟ ئەو شتانەی ئەنجامیان نەدابوو، کارانێك بوون کە ئەنجامدانیان ئەرکێکی هێندە سەخت نییە لەسەر مرۆڤ و تەنها بەکارهێنانی ئیرادەیەکی کەم و بڕێك هەستیاری دەوێت. بەڵێ، یەکێك لەوان لە ژیانیدا سەرقاڵی خواردنی گۆشتی مرۆڤەکان بووە و ئەوی دیشیان بەرامبەر پیسبوون بە پڕژی میز بێباکانە مامەڵەی کردووە. ئەو کەسەی کە غەیبەتی کردووە و ژیانی خۆی بەو جۆرە بە هەدەر داوە، گەر مافی ئیرادەی بدایە، بێگومان دەیتوانی غەیبەت لە ناو ببات تا لە گۆڕدا ئازار نەدرێت. بەڵام دەبینیت کە ئەنجامەکە بەم جۆرە نەبووە. ئەی ئەوی تریان؟ نەیدەتوانی لە کاتی شکاندنی دەستنوێژدا جلوبەرگەکانی خاوێن ڕابگرێت؟ ئایا ئەمە بەرپرسیارێتییەکی هێندە گرانە وا نەیتوانی تێیدا سەرکەوتوو بێت؟ نەخێر! هۆکاری سزا کێشانی ئەم دوو کەسە شکستهێنانە لەو بابەتانەدا کە لە ڕاستیدا بەجێهێنانیان زۆر سەخت نییە.

پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام) لە پێناو بەرزکردنەوەی ئاستی هاوەڵانیدا، نموونە ئیرشادییەکانی هەندێك جار لە جیهانی "ملك" و هەندێك جاریش لە جیهانی "برزخ" نیشان دەدان. لەو ڕۆژەدا هۆکاری سزای ئەو دوو کەسەی بۆ ڕوون کردنەوە و داوای لێکردن بە تایبەت

ئاگاداری ئەو دوو خاڵە بن. بە گوێرەی ئەمە پێویستە هەموو ئیماندارێك ئاگاداری خۆ پاك کردنەوە بێت کاتێك لە تەوالێت دێتە دەرەوە "الاستبراء" و پاشەڕۆی میز نەپرژێنێت بە جلەکانیدا. چۆن نوێژ بێ دەستنوێژ قەبووڵ نابێت، هەتا خاوێنییەکی باشیش بەدی نەیەت، ئەو دەستنوێژەی دەگیرێت پەسەند ناکرێت. لە پاش دەستنوێژ تەنها دڵۆپێك میز (گەر عوزر نەبێت)، دەستنوێژەکە بەتاڵ دەکاتەوە. بۆیە پێویستە لەسەر ئیماندار ئاگاداری "الاستبراء" بێت و پاش دڵنیابوون لە وشکبوونی میز، ئینجا دەستنوێژ هەڵبگرێت. لە هەمان کاتدا ئەو، پێویستە لە کاتی دەست بە ئاو گەیاندندا تا دوا ڕادده ئاگادار بێت، هەوڵ بدات تا لە دەستی دێت ئەو جلانە خاوێن ڕابگرێت کە دەستنوێژیان پێوە دەگرێت. بە تایبەتی دەبێت ئەو کەسانەی دەچنە پێگەی ئیمامەتییەوە و پێشنوێژی بۆ کۆمەڵێك دەکەن، زۆر زیاتر ئاگاداری ئەم خاوێنییە بن. بە جۆرێك پێویستە نەهێڵن هێندەی چاوی باڵندەیەك پیسی لە بەرگی ناوەوەیاندا هەبێت و زوو زوو بەرگی ناوەوەیان بگۆڕن و لەم بابەتەدا تا دوا ڕادده هەستیارانە مامەڵە بکەن.

ئیمانداران وەك چۆن ئاگایان لە خاوێنیی دەرەوەیانە، پێویستە پابەندی خاوێنی دەمیشیان بن. بە بۆنی دەمی ڕۆژووەوانەوە کە پەسەندترین بۆنە لەلای خوای گەورە، بچنە خزمەتی و ڕۆژووی غەیبەت کردن بە زمانیان بگرن. ئەوانەی سەرکەوتن لەم ڕۆژووەدا بەدەست دەهێنن، لە گۆڕەکانیاندا ئارام دەبن و پشت بە خوا لە حزووری پەروەردگاریشدا دەبنە شایستەی بەدەستهێنانی لوتفگەلێکی بێهاوتا.

لێرەدا خاڵێك سەرنجمان ڕادەکێشێت. کاتێك پێغەمبەری خوا هۆکاری سزادانی دوو مرۆڤمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، نیشانمان دەدات کە یەکێکیان هۆکارەکەی گوێنەدانە بە میز و ئەوی تریان لەبەر غەیبەتکردنە. چۆن هەستیار نەبوونی مرۆڤ لەمەڕ تارەت "طهارة"، کار لەو پەرستشانەی دەکات کە بە دەستنوێژەوە ئەنجام دەدرێن و بەتاڵیان دەکاتەوە، غەیبەتیش کاریگەرییەکی نەرێنی وەهای هەیە کە کردەوە چاکەکان دەخوات و لە ناویان دەبات. چۆن لە هەندێك ڕیوایەتدا باس لەوە دەکرێت کە غەیبەت دەستنوێژ و نوێژ و ڕۆژوو بە هەدەر دەبات، کەمتەرخەمی لە "الاستبراء" و "الاستنجاء"یشدا پەرستشەکان بە هەدەر دەدات. زۆر کەس وا دەزانێت کاملانە دەستنوێژ دەگرێت و نوێژ دەکات، بەڵام ئەو دەستنوێژەی گرتوویەتی، جێی خۆی نەگرتووە، ئەو نوێژەش بە ئەنجامی گەیاندووە، قەبووڵ نەکراوە. بۆچی؟ چونکە ئامادەسازی پێویستی بە تەواوی نەکردووە و ئاگاداری خاوێنی نەبووە. ڕەچاوکردنی ئەو ئامادەسازییانەی لەم بوارەدا پێویستە سەرکەوتنێکی گەورەیە.

غەیبەتیش بە هەمان شێوەیە. هەندێك کەس نوێژ دەکات، ڕۆژوو دەگرێت، دەچێتە حەج بەڵام لەملاوە بەردەوام غەیبەتی کەسانێك دەکات. نازانێت بەم جۆرە لە لایەکەوە خشتی کۆشکەکانی بەهەشتی دەخاتە سەر یەك و لە لایەکی تریشەوە بە خراپی تێکیان دەشکێنێت. نوێژ دەکات و خشتێك دادەنێت بەڵام بە غەیبەتکردن درزێك دەکاتە دیوارەکەی. ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە و پێویستە چەند زووە چارە بکرێت. بەڵێ، لە زەمینێکی وادا دەژین کە پێویستە تێیدا تەواو بە ئاگا بین. گەر نومێد بکەین کردەوەکانمان هەم لە ڕوانگەی ماددی و هەم لە ڕوانگەی

مەعنەوییەوە بە شێوازێکی گەش و خاوێن بەرز بیێتەوە بۆ پەروەردگاری مەزن، دەبێت لەم لایەنەوە کۆنترۆڵی خۆمان بکەین.

لە سەدەی بەختەوەریدا هاوەڵێك بە ناوی "ماعز" سزای مەرگ درا. ماعز مرۆڤێکی ئیماندار بوو و سەرەڕای ئەوەی تاوانێکی گەورەی ئەنجام دابوو، بەڵام پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) گرنگییەکی زۆری بە ئیمانی ئەو دەدا. گەرچی تاوانێکی گەورەی وەك زیناشی ئەنجام دابێت، نەدەبوو بە نەشیاوی باسی بکرێت. ماعز خاوەن ئیمانێکی قووڵ و ڕەگداکوتاو بوو، لە شوێنێك ئەو گوناهەی ئەنجامدابوو کە هیچ کەس نەیبینیبوو، بەڵام دواتر کاتێك هەستی بەرپرسیاربوونی دواڕۆژ بەرامبەر بە خوا ویژدانی هەژاندبوو، هات و لە حزووری نازیزماندا دانی بە تاوانەکەیدا نا. سەرەڕای ئەوەی پێغەمبەری خوا چەندین جار ڕێگەی لێبووردنی نیشاندا، کەچی ئەو لە هەموو جارەکاندا پێداگری دەکرد و داوای دەکرد سزای تاوانەکە چییە وەریبگرێت. پاش ئەوەی سزای مەرگ درا، دوو کەس دەربارەی ئەو وتیان "تۆ تەماشای ئەوە بکەن چۆن سەرەڕای شاردنەوەی گوناهەکەی لەلایەن خواوە هات گوناهەکەی ئاشکرا کرد و سزای مەرگی وەرگرت! کارێکی ئەنجامدا کە هەر لە سەگ دەوەشایەوە بۆیە وەك سەگ لەناوبرا."، پێغەمبەری خوا گوێبیستی ئەم قسە قورسانە بوو دەربارەی ماعز، بەڵام بۆ ئەو کاتە بێدەنگی هەڵبژارد. پاش ماوەیەك لاکی تۆپیوی گوێدرێژێکیان بینی، پرسیاری کرد "فڵان و فڵانە کەس لە کوێن؟". ئەو دوو کەسە ئامادەبوون و وتیان "ئێمە لێرەین ئەی نێردراوی خوا!"، ئەویش پێی فەرموون "فەرموون! قەپاڵ بدەن لەو لاکی گوێدرێژە! (ئەمدیو ئەودیوی

بکەن و بیبەن بۆ لوتتان!)". ئەو دوو کەسە وتیان "ئەی نێردراوی خوا! چ مرۆڤێك دەتوانێت ئەم لاکە بخوات؟"، پێغەمبەریشمان فەرمووی "ئەو قسانەی کەمێك بەر لە ئێستا دەربارەی ماعزی براتان وتتان، زۆر خراپتر و قێزەونترە لە گازگرتن و بە دەم ئەمدیو ئەودیوکردنی ئەم لاکە تۆپیوە. سوێند دەخۆم بە خوا (ئێوە چەند عەیبداریشی بکەن) ماعیز ئێستا سەرقاڵی مەلەکردنە لە نێو ڕووبارەکانی بەهەشتدا."[١]

ڕۆژێك عەمری کوڕی عاص (رضي الله عنه) لەگەڵ هاوڕێکانیدا پێکەوە دەڕۆشتن و لە ڕێگا هێسترێکی مردارەوەبوویان بینی، بە هاوڕێکانی وت "سوێند دەخۆم کەسێك لە ئێوە لە جیاتی ئەوەی غەیبەتی برا موسوڵمانەکەی بکات، سکی خۆی لە گۆشتی ئەم ئاژەڵە تێر بکات گەلێك باشترە." بەم شێوازە بۆ جارێکی تر ئەو وانەیەی فێر کردنەوە کە لە پێغەمبەری خوا فێری بووبوو.

بەڵێ، ئیماندار گەر گوناهیش بکات هەر بەڕێزە. نابێت غەیبەتی بکرێت. بە هەر هۆکارێك بێت غەیبەت هێندەی قەپاڵدان لە لاکێکی تۆپیو و ئەمدیو ئەودیوکردنی و بۆن پێوەکردنی قێزەونە. تۆڵەی هەڵسوکەوتێکی وەهاش لە جیهانی بەرزەخدا لە شێوەی دەم خستنە نێو لاشەیەکی بۆگەنکردووەوە دەرکەوتەی دەبێت و لە گۆڕدا ئەو بۆنە بێزراوە ناشرین و قێزەونە تێکەڵ بە هەناسە دەکرێت.

غەیبەت، هەم لە دونیادا و هەم لە ئاخیرەتیشدا مرۆڤ توشی دۆخێکی گەلێك دژوار دەکات. بە پێی هەواڵدانێکی پێغەمبەری خوا "لە ڕۆژی

١. النسائي، سنن الكبرى ٢٧٧/٤.

قیامەتدا ئەو کەسەی لە دونیادا گۆشتی براکەی خواردووە (ئەوەی غەیبەتی کردووە) دەهێنرێت و ئەو گۆشتەی خواردوویەتی دەخرێتە بەردەمی و پێی دەوترێ "چۆن لە دونیادا گۆشتی مردووی براکەت خوارد، ئێستاش ئاوا زیندوو زیندوو بیخۆ!". ئەویش بە دەموچاوێکی گرژ و بە هاوار و ناڵەوە ئەو گۆشتە دەخوات".[1]

وەك بەدیعوززەمان دەڵێت "تۆ کە لە ڕۆژدا بە خەبەریت و قسەیەکی جوان دەکەیت، هەندێك جار لە شێوەی سێوێکدا بە شەو لە خەونتدا دەیخۆیت. وتەیەکی ناشرینت، شەو لە شێوەی شتێکی تاڵدا قووتی دەدەیت. غەیبەتێك بکەیت، لە شێوەی گۆشتی مردارەوەبوودا دەرخواردتی دەدەن. کەواتە ئەو وتە جوان و ناشرینانەی لەم خەونی دونیایەدا دەیڵێیت، لە شێوەی میوەدا لە جیهانی بەناگاییدا کە دوارۆژە، دەیانخۆیت. بۆیە خواردنی ئەو میوانە بە دوور مەزانە."[2]

مرۆڤ لە دوارۆژدا ڕووبەڕووی ئاوێنەی کردەوەکانی دونیای دەکرێتەوە. کردەوە چاکەکانی دونیا، لەوێ دەچوێنرێنە سەر شکڵ و شێوەی جوان و، تیشکدانەوەی خراپەکانیش لە شێوەی تابلۆگەلێکی ناشریندا دەردەکەون. بۆ نموونە نوێژی ئەو کەسانەی لەم دونیادا نوێژ بە چاکی بەجێدەهێنن، لە دوارۆژدا لە شێوەی دۆست و هاوڕێیەکی ڕوخسار جوان و قەد و باڵا ڕێك و شیکدا دێتەوە لامان. یەك "لا اله الا اللّٰه"ی ئێرە لەوێ بۆمان دەبێتە کلیلی دەرگای بەهەشت، "الحمد لله"ش وەك میوەیەکی بەهەشت دێتەوە بەردەممان. ئەنجامی کردەوە باشەکان بەم شێوەیە دەبن

١. الطبراني، المعجم الأوسط ١٨٢/٢

٢. بەدیعوززەمان سەعید نوورسی، وتەکان، وتەی ٣١.

دەرکەوتەی خراپەکانیش شێوەی ناشرین و ناخۆشیان دەبێت. وەک لە فەرموودە پیرۆزەکەدا هاتووە غەیبەت کردەوەیەکی هێندە ترسناک و قێزەونە، لە دوارۆژدا یەکسان دەبێت بە خواردنی مرۆڤ. وەک چۆن کۆمەڵێک لەو شتانەی لە خەوندا دەیانبینین ڕەنگدانەوەی جیهانی میسالن و واتای ئەم دونیایەمان لە شێوەی جیاجیادا دەدرەوشێتەوە، ڕەنگدانەوەی دوارۆژی هەندێک خراپەی وەک غەیبەتیش قێزەون و ترسناک دەبێت. بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی تابلۆیەکی وەها نەبێتەوە، پێویستە مرۆڤ لە ژیانی دونیایدا زۆر ئاگاداری گوفتارەکانی بێت و هەر دەستەواژەیەکیش کە بە نیازە دەریببڕێت لە تەرازووی ویژدانی بدات ئینجا بیڵێت.

زیانێکی گرنگی غەیبەت بریتییە لە خواردنی چاکەکانی مرۆڤ. حەزرەتی حەسەن بەسری بەم وتەیەی سەرنجمان بۆ ئەمە ڕادەکێشێت "دووربن لە غەیبەت! بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە غەیبەت خێراتر لە سوتان و بە خۆڵەمێشبوونی دار کردەوە باشەکان دەخوات و دەسوتێنێت"[1]، بەڵێ غەیبەت، هەر وەک چۆن کرمۆکەکان لە ناوەوە دارەکەی دەستی حەزرەتی سولەیمانیان دەخوارد، دەچێتە نێو دەفتەری چاکەکانەوە و کردەوە چاکەکانی ئیماندار وا لێدەکات نەخوێنرێنەوە. ئیماندار کە دەچێتە خزمەت پەروەردگاری، بە کۆمەڵێک کردەوەی زۆر و بە ئومێدی سەرکەوتنەوە دەڕواتە خزمەتی، بەڵام کاتێک ئەو ڕووبەڕووی ئەو زیانانە دەبێتەوە کە غەیبەت بە کردەوەکانی گەیاندووە، شۆک دەبێت. وەک بازرگانێکی مایەپووچ ئاخ و داخ دەکێشێت. دەڵێت "من لە کوێ هەڵەم کرد!"، بەڵام ئیدی زۆر درەنگ دەبێت بۆ ئەو لێپێچینەوەیە. ئەو

---

[1] ابن أبي الدنیا، الغیبة و النمیمە ١٣٥.

لێپێچینەوەیە دەبێت لە دونیادا ئەنجام بدرایە و گەردنئازادی لەسەر ئەو تاوانانە بکرایە کە پەیوەندییان بە مافی بەندەوە هەیە، لەبری ئەوەی وا بکەین لەولا دۆخێکی دژوار و پڕوکێنەر بێتە ئاراوە، دەبێت دەفتەری کردەوەکانمان زۆر خاوێن ڕابگرین و نەهێڵین شتانی نامۆ و زیانبەخشی وەک غەیبەتی بێتە ناو. بە پێچەوانەوە لە ڕۆژی دواییدا ڕووبەڕووی دەرەنجامێکی تەواو سامناک دەبینەوە. جەنابی حەق دەفەرموێت:

﴿ مَا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴾ (ق: ١٨)

"تاکە وشەیەك نییە لە دەمی مرۆڤ دەرچێت و فریشتەی چاودێر تۆماری نەکات".

کاتێك بۆ ژیانی بێ کۆتا بە خەبەر دێین و دەبرێینە بەردەم لێپرسینەوە، هەموو ژیانمان دەرژێنرێتە بەردەممان و پێمان دەوترێت:

﴿ اقْرَأْ كِتَابَكَ ﴾ (الإسراء: ١٤)

"دەفتەرەکەت بخوێنەرەوە (نامەکەت بخوێنەرەوە)...".

لە ڕاستیدا هەموو کەسێك لە دوارۆژدا بەرەو هۆڵی دادگای گەورە هەنگاو دەنێت. ڕۆژان دێت و دەوران دەڕوات پاشان هەموو مرۆڤایەتی لە حزووری حاکمی تاك و تەنهای قەهھاردا دەربارەی هەموو کردەوەکانی لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت لە شێوەی میوەی بەهەشتدا پاداشتی کردەوە چاکەکانی وەردەگرێت و، سزای خراپکارییەکانیشی لە شێوەی زەقومی دۆزەخدا دەبینێتەوە.

لە ڕۆژی دواییدا کە "دیداری هەرە مەزن"ە، بەشێك لە کردەوە باشەکانی ئەو کەسەی غەیبەتی کردووە، دەدرێتە ئەو کەسەی غەیبەتەکەی کراوە. لە ڕیوایەتێکدا هاتووە کە لە ڕۆژی دواییدا دەفتەری کردەوەکان بە کراوەیی دەخرێتە بەردەم مرۆڤ و ئەویش هەندێك کردەوەی چاك دەبینێت کە لە ڕاستیدا ئەم ئەنجامی نەداون. کاتێك دەڵێت "خوایە گیان ئەمانە لە کوێوە هاتوون؟ من بیرم نایەت کردەوەیەکی وەهام ئەنجام دابێت."، پێی دەوترێت "ئەمە کردەوەی باشی ئەو کەسانەیە کە غەیبەتی تۆیان کردووە". بە هەمان شێوە کاتێك دەفتەری کردەوەکان دەدرێتە کەسێکی تر و پاداشتی هەندێك لە کردەوە باشەکانی نابینێت، دەپرسێت "پەروەردگارا! ئایا من لە فلان و فلان بەرواردا ئەم کردەوە باشانەم ئەنجام نەداوە؟". وەڵامی ئەویش بەم جۆرە دەدرێتەوە "لەبەر ئەوەی غەیبەتی مرۆڤەکانت کردووە، ئەوانە سڕاونەتەوە و خراونەتە سەر دەفتەری غەیبەتکراوەکان."[1]

جا گەر ئەو مرۆڤەی غەیبەت دەکات کردەوەی باشی نەمابێت، ئەوا ئەم جارە بەشێك لە گوناهەکانی کەسی غەیبەتکراو دەخرێتە سەر تۆماری گوناهەکانی ئەو کەسەی غەیبەتی کردووە. لەو ڕۆژەدا تای کام لایەی تەرازووەکە قورستر بێت، دادگەریی ئیلاهیش بەو پێیە مامەڵە دەکات. واتە گەر تای چاکەکان یەك گرام لە تای خراپەکان زیاتر بێت، ئەو کەسە ڕزگاری دەبێت، گەر تای خراپەکانیش قورستر داهات لە تای چاکەکان، ئەوا ئەو کەسە گەر بەر لوتفێکی زیادەی خوا نەکەوێت، سزاکەی لە دۆزەخ وەردەگرێت. لەو ڕۆژەدا کێشانەیەکی هەستیارتر لە

١. علي المتقي، كنز العمال ٢/٢٣٦.

کێشانەی زێڕینگەران بەکاردێت و سزا و پاداشت ڕوون و ئاشکرا دەبن. بۆیە دەبێت هەرگیزاو هەرگیز گرنگی بوونی چاکەیەکی یەک گرامی لەسەر خانەی پاداشتمان و، ڕادەی ترسناکیی زیادبوونی قورساییەکی یەک گرامیش بۆ سەر تای گوناهەکانمان لە یاد نەکەین.

مرۆڤ دەتوانێت بە کردەوە جوانەکانی خانەی پاداشتی پڕ بکاتەوە و بە خراپەش ئەو پاداشتانەی هەیەتی لە ناوی بەرێت. بەڵێ، گوناهی وا هەیە سەرجەم کردەوە چاکەکانی مرۆڤ و هی واش هەیە بەشێکی گرنگیان دەسڕێتەوە. بۆ نموونە ئەو کەسەی تەمەنی بە موسوڵمانێتی بەسەر بردووە گەر خوا نەخواستە هەستێت بە ئەنجامدانی گوناهێکی گەورەی وەک هاوبەش بڕیاردان بۆ خوا، ئەوا هەموو ئەو کردەوە جوانانەی تا ئەو ڕۆژە ئەنجامیداون بە پووچی دەمێننەوە و سەنگی خۆیان لەدەست دەدەن و لای خوای گەورە هیچ بەهایەکیان نامێنێت. بەڵێ، کاتێک ئیمان لەدەست دەدرێت، سەرجەم ئەو جوانییانەش کە وابەستەی ئەون لەناو دەچن و نامێنن. بە هەمان شێوە هەندێک گوناهیش هەیە، وەک چۆن ئاگر دار دەسوتێنێت و دەیکاتە خۆڵەمێش، ئاوا زیان بە کردەوە چاکەکانی مرۆڤ دەگەیەنێت. باشترین نموونەی ئەو جۆرە گوناهانەش غەیبەت و ئیرەیی بردنە. ئەم دوو تاوانە وەک بۆمبێک قەڵای پاداشتی مرۆڤ خاپوور دەکەن و دەیدەنە بەر با. بە چواندنێکی تر غەیبەت وەک ئەو گورگە وایە کە بەر دەبێتە نێو ڕانێکی مەڕەوە. ئەو هەر وەک ئەو زیانەی کە گورگ بە بەرخەکانی دەگەیەنێت، زیان لە کردەوە چاکەکانی مرۆڤ دەدات. گەر غەیبەت لە ڕوواڵەتدا بە ویستنی خراپەی کەسانی تریش دەربکەوێت، لە ڕاستیدا خراپەیە بەرامبەر بە خودی ئەو کەسە

خۆی. بە ئەنجامدانی ئەو دوو گوناهە، مرۆڤ ئەوە بەرامبەر بە خۆی دەکات کە دوژمنەکەی دەیکات و بۆ کەسی بەرامبەریش وەك دۆستێك مامەڵە دەکات. چونکە ئەم دوو گوناهە پاداشتەکانی ئەو کەسە دەگوازێتەوە بۆ کەسی غەیبەتکراو و گوناهەکانی غەیبەت کراویش بۆ کەسی غەیبەتکار دەگوازێتەوە. کاتێك لەم ڕوانگەیەوە بۆ بابەتەکە دەڕوانین، باشتر لەوە حاڵی دەبین کە غەیبەت و حەسوودیی دوو کردەوەی تا بڵێی گەوجانەن. کەسێك بە حەزرەتی حەسەنی بەسری وت "بیستوومە کە غەیبەتم دەکەیت!" ئەویش وەڵامێکی زۆر وردی دایەوە و فەرمووی "هێندە بە کەسێکی بەنرخت نازانم تا بتکەمە حاکم بەسەر پاداشت و کردەوە چاکەکانمەوە." و بەم جۆرە ئەو کەسەی بێدەنگ کرد. عەبدوڵڵای کوڕی موبارەکیش بە خەندەوە و بەم جۆرە گوزارشتی لەم ڕاستییە کردووە و فەرموویەتی "گەر غەیبەتی کەسێکم کردبایە، بێ گومان دایك و باوکم دەبوون. چونکە ئەوان لە هەموو کەس زیاتر مافی ئەوەیان هەیە پاداشتەکانی من بۆ خۆیان ببەن."

مرۆڤی ژیر ئەو کەسەیە کە باش حسابی خۆی دەکات و هەنگاوی ڕاست هەڵدەنێت. ئەو کەسەی هەنگاوێك بەرەو پێش و دوو هەنگاو بەرەو پاش دەنێت، بەرەو پاش دەڕوات نەك بەرەو پێش. مرۆڤیش نابێت کردەوە چاکەکانی بە تاوانی دزێوی وەك غەیبەت و حەسوودی لەناو بەرێت، بەڵکو بەردەوام دەبێت لە هەڵپەی ئەوەدا بێت بەردێکی تر بخاتە سەر بەردی کردەوە باشەکانی. ئەوەتا ئێمە لە پێناو بەدەستهێنانی ئەنجامێکی دونیاییدا لە تاقیکردنەوەکاندا ئارەق دەڕێژین و بە وردی و وریایی وەڵام دەدەینەوە تا وەڵامە ڕاستەکانمان بە وەڵامی هەڵە نەسڕینەوە، دەی ئایا نابێت لە

تاقیکردنەوەی ڕاستەقینەماندا کە بۆ بەدەستهێنانی دوارۆژە زیاتر وریابین و هەستیارانەتر مامەڵە بکەین؟.

ئەو غەیبەتەی لە پێش یان لە پاش پەرستشەکان دەکرێت، پاداشتی پەرستشەکان کەم دەکاتەوە و زیان بە کەماڵیان دەگەیەنێت. بۆیە لە وتەیەکدا کە بۆ ئازیزمان، دەگەڕێنرێتەوە "غەیبەت، دەستنوێژ و نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە."[1] تەنانەت کەسانێك هەبوون تێگەشتنی ڕەهایان بۆ ئەم فەرموودەیە هەبووە و وتوویانە لە کاتی وتنی هەر شتێکی حەرامدا پێویستە دەستنوێژ نوێ بکرێتەوە، بەڵام زۆرینەی زانایانی ئیسلام کۆکن لەسەر ئەوەی ئەم دەربڕینە ئەوە دەگەیەنێت کە غەیبەت لە پاداشتی نوێژ و دەستنوێژ کەم دەکاتەوە وەك لەوەی بە تەواوی بەتاڵیان بکاتەوە.

حەزرەتی ئەنەسی کوڕی مالیك دەگێڕێتەوە "پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمْ) فەرمانی بە ڕۆژوو گرتن کرد و فەرمووی "تا من مۆڵەت نەدەم کەس ڕۆژووەکەی نەشکێنێت". لەسەر ئەمە مرۆڤەکان نییەتی ڕۆژوویان هێنا. کە ئێوارە داهات پیاوان یەك یەك دەهاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا بۆ مۆڵەت خواستن و دەیانوت "بە درێژایی ڕۆژ بەڕۆژوو بووم ئەی نێردراوی خوا! گەر دەرفەتم بدەیت دەمەوێت بەربانگ بکەمەوە". پێغەمبەری خواش مۆڵەتی دەدان. دواجار کابرایەك هات و داوای مۆڵەتی بۆ دوو کچی گەنج کرد و وتی "ئەی نێردراوی خوا! دوو کچی لاو لەو نزیکانە بەڕۆژوون. گەر مۆڵەت بدەیت دەیانەوێت ڕۆژووەکەیان بشکێنن."

---

١. علي المتقي، كنز العمال ٣/٢٣٤.

پێغەمبەری خواش وەڵامی ئەم داواکارییەی نەدایەوە. کاتێك ئەو کەسە داواکارییەکەی دووپات کردەوە ئازیزمان فەرمووبیان "ئەو دووانە ڕۆژوویان نەگرتووە. ئەوەی بە درێژایی ڕۆژ گۆشتی مرۆڤەکانی خواردبێت چۆن بەڕۆژوو دەبێت؟ بڕۆ و پێیان بڵێ "گەر دەڵێن ئێمە بەڕۆژوو بووین، با بڕشێنەوە!" کابرا ڕۆیشت و وتەکانی ئازیزمانی بەو دوو کچە گەنجە ڕاگەیاند. ئەوانیش لەسەر ئەو فەرمانە ئەوەی وترابوو بەجێیان هێنا، ئەوە بوو هەردووکیان خوێنیان هەڵهێنایەوە. کاتێك ئەو کەسە گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا و دۆخی ئەوانی پێ ڕاگەیاندن، ئازیزمان فەرمووی "گەر بمردنایە و ئەو گۆشتەی کە بە غەیبەتکردنی مرۆڤەکان خواردبوویان لە گەدەیاندا بمایەتەوە بێگومان ئەو گۆشتانە دەبووە خواردنی ئاگری دۆزەخ."[1]

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە ڕۆژێکیان دوو پیاو کە بەڕۆژوو بوون لە پاڵ یەکێك لە دەرگاکانی "مسجد الحرام"دا دانیشتبوون، کەسێك بە لایاندا تێپەڕی کە سەرەتا چەند هەڵسوکەوتێکی ژنانەی نیشاندا و پاشان خۆی ڕێکوپێك کردەوە. پاشان ئەو دوو پیاوە دەربارەی ئەو کەسە وتیان "هێشتا شوێنەواری کەسێتییەکی ژنانەی تێدایە." لەم کاتەدا قامەت کرا بۆ نوێژ. ئەو دوو زاتە چوونە نێو مزگەوتەکەوە و نوێژیان دابەست. لە نێو نوێژەکەدا ئەو قسەیەی کە دەربارەی ئەو کەسە کردبوویان، دەستیکرد بە ئازاردانی ویژدانیان. پاش سەلام دانەوە، هەردووکیان پێکەوە ڕۆشتنە لای زانای ئیسلام عەتای کوڕی ڕەباح و بابەتەکەیان لای ئەو کردەوە.

---

١. أبو نعيم، حلية الأولياء ٣٠٩/٦.

عەتاش پێی وتن سەر لەبەر دەستنوێژ بگرنەوە و نوێژ و ڕۆژووەکەشتان بە قەزا بگێڕنەوە.[1]

بەڵێ، دەبینین کە غەیبەت، فەیز و پاداشتی پەرستشە ئەنجامدراوەکان لەناو دەبات. دەبێت ئیماندار سووربێت لەسەر ئەوەی ژیانی بە هەستی ئیحسانەوە بەسەر بەرێت؛ پێویستە سەرجەم پەرستش و هەڵسوکەوتەکانی بەو هەستەوە بێت کە خوای گەورە ئاگای لێیەتی و دەیبینێت؛ تەقەلا بدات بۆ بەجێهێنانی پەرستشەکانی بە جوانترین شێواز و بەو ئاڕاستەیەدا هەنگاو بنێت کە ڕۆژ بە ڕۆژ باشتر بەجێیان بهێنێت. پێویستە لەم ڕێیەدا نەهێڵێت گوناهێکی وەك غەیبەت زیان بەو جوانییانە بگەیەنێت کە ئەنجامی دەدات.

بەداخەوە ئەمڕۆ لە ژیانی بەندایەتیدا هەڵەیەکی زۆر زەق بەدی دەکرێت، ئەویش بریتییە لەوەی هەندێك جار مرۆڤ لە لایەکەوە ویستەکانی پەروەردگار بەدی دەهێنێت، بەڵام لە لایەکی ترەوە دەچێت ئەو کارانە ئەنجام دەدات کە جێی ڕەزامەندی خوای گەورە نین. ئەمە لە کاتێکدا نابێت دووری نێوان فەرزەکان و حەرامەکان هێندە کەم بێت. بۆیە نابێت مرۆڤەکان کە لە کاتی نوێژە فەرزەکاندا دێنە مزگەوت بە مەبەستی ئەنجامدانی نوێژەکان بە کۆمەڵ، دواتر لە حەوشەی مزگەوتدا بکەونە غەیبەتی ئەم و ئەو و بەم جۆرە پاداشتی پەرستشەکەیان بە هەدەر بدەن. نابێت ئەو خانمانەی کە لە گەڕەکەکانیان و لە پێناوی خوای گەورەدا کۆ دەبنەوە بۆ قورئان خوێندن و وانەی ئایینی و سوحبەتی

---

١. بیهقی، شعب الایمان.

جانان، دواتر غەیبەتی یەکدی بکەن. کاتێك ئێمە لەلایەکەوە لە پێناوی بەدەستهێنانی پاداشتدا دەستنوێژ دەگرین و دەچینە مزگەوت و نوێژ دەکەین و گوێ لە پەند و ئامۆژگاری دەگرین و کردەوەی چاك ئەنجام دەدەین، نابێت لە لایەکی دیکەوە بچین تێزابی غەیبەت بڕژین بەسەر هەموو ئەم کردەوانەدا. ئایا ئەم دۆخە بە گوێرەی هەستی بەندایەتی و ژیانی پەرستش دژیەکییەکی ڕوون وێنا ناکات؟ بۆیە ئیمانداره خاوەن هەستەکان نابێت بەم جۆرە مامەڵە بکەن. شایەت گەر بە پێچەوانەوە هەڵسوکەوت بکەن، پێویستە چاوێك بە خۆیاندا بخشێننەوە و بە هەر نرخێك بێت جڵەوی زمانیان بکەن و بە زمانیان ئەو پاداشتانە نەسڕنەوە کە لە دەفتەری کردەوە باشەکانیاندا نوسیویانە.

پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا دەربارەی چەندین شت ئامۆژگاری حەزرەتی مەعازی کوڕی جەبەلی کرد، هۆشدارییەکەی بۆ ئاگابوون لە بەڵای زمان و غەیبەت زۆر واتادارە. مەعازی کوڕی جەبەل (رضيَ اللهُ عَنْهُ) گفتەگۆکەی نێوان خۆی و ئازیزمان بەم جۆرە دەگێڕێتەوە بە سەرداری پێغەمبەرمانم وت "ئەی نێردراوی خوا! کردەوەیەکم پێ بڵێ کە لە ئاگری دۆزەخ دوورم بخاتەوە و لە بەهەشتیش نزیکم بکاتەوە". ئەویش فەرمووی "لە ڕاستیدا تۆ بوویتە داواکاری کارێك کە ئەنجامدانی سەخت و پڕ چەرمەسەرییە. بەڵام لە هەمان کاتدا ئەم کارە تا بڵێیت ئاسانە بۆ ئەو کەسانەی کە خوای گەورە لە ئەنجامدانی کردەوەی باشدا سەرکەوتووی کردوون. بەم شێوەیە: بێ ئەوەی هیچ شتێکی بە هاوبەش بۆ بڕیار بدەیت، تەنها بەندایەتی خوای گەورە بکە. نوێژ (بە ڕەچاوکردنی ڕوکن و مەرجەکانی) بەجێ بهێنە، زەکات بدە، ڕۆژووی

مانگی ڕەمەزان بگرە. گەر توانای ڕۆیشتنت هەبوو حەجیش بکە." پاشان بەم جۆرە لە فەرمایشتەکانی بەردەوام بوو "تەماشاکە! (مادەم پرسیوتە) دەرگاکانی خێریشت نیشان دەدەم: ڕۆژوو قەڵغانە (لە بەرامبەر دۆزەخ و ئەو ڕێگای گوناهانەی کە دەچنەوە سەر دۆزەخ)؛ سەدەقە وەك چۆن ئاو ئاگر خامۆش دەکات، شوێنەواری گوناه ناهێڵێت. ئەو نوێژەش کە لە نیوەشەودا دەکرێت، هەم شوێنەواری گوناهەکان دەسڕێتەوە و گسکیان لێ دەدات، هەم... (سوودەکانی لە ژماردن نایەن)"، پاشان ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندەوە:

﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ (السجدة: ١٦-١٧)

"بۆ بەجێهێنانی شەونوێژ لە پێخەفەکانیان هەڵدەستن و لە خەمی سزا و بە ئومێدی میهرەبانی ئەو، دوعا دەکەن و لە خوا دەپاڕێنەوە و لە ڕێی خوای گەورەدا لەو داراییە سەرف دەکەن کە پێمان بەخشیون. ئیدی کەس زانا نییە بەو نیعمەت و پاداشتە چاو ڕەوێن و دڵڕفێنانەی بۆمان داناون لە بەرامبەر ئەو کردەوە باشانەی لە دونیادا ئەنجامیانداوە"

پێغەمبەری ئازیز (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە پاش ئەم ئامۆژگارییە زێڕینانە فەرمووی "دەتەوێت سەرەکیترین بناغە و کۆڵەکە و بەرزترین لوتکەی ئاینت پێ بڵێم؟" منیش وتم "خۆشحاڵ دەبم ئەی نێردراوی خوا!" فەرمووی "بناغەی سەرەکی ئایین، ئیسلامە (شەهادەت هێنانە)؛

کۆڵەکەکەی نوێژە، لوتکەکەشی جیهادە.'' پاشان فەرمووی ''پێشت بڵێم چۆن بتوانیت بە شێوازێکی ئاسان هەموو ئەمانە بەرجەستە بکەیت و بە چ شتێک بەردەوامیان پێ ببەخشیت؟''، منیش وتم ''زۆر باش دەبێت ئەی نێردراوی خوا!'' پاشان بە دەستی موبارەکی زمانی گرت و نیشانی دا و فەرمووی ''ئەمە بەدوور بگرە لەو شتانەی دژی خەڵکین (زۆر قسەی بێ سوود مەکە)!''. منیش (بە سەرسامییەوە) وتم ''ئەی نێردراوی خوا! ئایا ئێمە بەرامبەر گوفتارەکانیشمان بەرپرسیار دەبین؟''. ئەویش فەرمووی ''دایکت ڕۆڵەڕۆت بۆ بکات ئەی مەعازا ئەوەی مرۆڤەکان بەرەو دۆزەخ پەلکێش دەکات بێجگە لە وتنی ئەوەی بە دەمدا دێت دەمێت چی بێت؟''[1]

کە سەرنج دەدەین دەبینین پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هۆشداریمان پێدەدات لەسەر مەترسیی کەوتنە نێو چاڵێکی قووڵ (خوا پەنامان بدات) و تلۆربوونەوە بۆ نێو دۆزەخ لەپاش گەیشتن بە بەرزترین لوتکەی ئاین لەبەر وریا نەبوون لە زمان. گەر لوتکەکانی ئاینمان بەدەست هێنابێت و دەرفەتی ئەوەمان بۆ ڕەخسابێت لە لوتکە زومرووتییەکانی دڵدا بێین و بچین، ناچارین هەوڵی مانەوە لەوێ بدەین و خۆمان لە کەوتنە خوارەوەش بپارێزین. یەکێك لە گرنگترین فەرمانبەرییەکان بۆ پارێزگاریکردن لەم پلەوپایەیە بێگومان جڵەوکردنی زمان و، یەك وتن لەپاش هەزار تێفکرین و قسەکردنە لەو بابەتانەی کە لە خولگەی ڕەزامەندیی خوای گەورەدان.

کەسێك دێتە لای حەسەنی بەسری و پێی دەڵێت ''فلانە کەس

١. الترمذي، الإيمان ٨.

غەیبەتی کردیت"، ئەویش قاپێکی پڕ لە خورمای جوان بۆ ئەو کەسە دەنێرێت کە غەیبەتەکەی کردووە و داواش دەکات ئەمەی پێ بوترێت "وەك بیستوومە لە پاداشت و کردەوە چاکەکانت دیاریت بە من بەخشیوە. منیش ویستم لە بەرامبەر ئەمەدا ئەم خورمایانەت بۆ بکەمە دیاری. بمبوورە کە دیارییەکەم تەواو هاوشانی دیارییەکەی تۆ نییە!"

بۆ ئەوەی لە ڕۆژی مەحشەردا لەو کەسانە نەبین کە پێغەمبەرمان بە مایەپووچ ناوزەدی کردوون، پێویستە لەسەرمان زۆر ئاگاداری کردەوە و قسەکانمان بین. نابێت ئەنجامدانی چاکەی زۆر هەڵمان بخەڵەتێنێت. مەردایەتیی ڕاستەقینە ئەوەیە لە پاڵ ئەنجامدانی کردەوە باشەکاندا بزانین چۆن پاداشتەکانیشیان بپارێزین و بە هەدەریان نەدەین. بۆیە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەپرسێت "دەزانن کەسی مایەپووچ کێیە؟". هاوەڵانیش لە وەڵامدا دەڵێن "بەلای ئێمەوە مایەپووچ ئەو کەسەیە کە پارەو سامانی نەماوە." پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەم شێوەیە بۆیان ڕوون دەکاتەوە "مایەپووچی ئوممەتەکەم، ئەو کەسەیە کە لە ڕۆژی قیامەتدا بە کردەوەکانی وەك نوێژ و ڕۆژوو و زەکاتەوە دێت، بەڵام لە دۆخێکدایە کە قسەی بەم وتووە و زینای داوەتە پاڵ ئەو و بوختانی بۆ کردووە و،ماڵی ئەمی خواردووە و خوێنی ئەوی ڕشتووە و لە ئەم و ئەوی داوە. بەم شێوەیە پاداشتی کردەوە باشەکانی دەدرێتە ئەم و ئەو و گەر پێش ئەوەی مافی بەندەکان لەسەری تەواو ببێت پاداشتی کردەوە باشەکانی کۆتاییان بێت، ئەو کاتە گوناهی خاوەن مافەکانی دەدرێت بەسەردا و لە کۆتاییشدا (وەك تاوانبارێك) فڕێ دەدرێتە دۆزەخەوە."[١]

---

١. مسلم، البر ٥٩.

بەڵێ، لە نێو گوناهـ و خراپەکاندا تاوانی ترسناکی وەك غەیبەت خۆیان مەڵاس داوە، کە ڕەنگە مرۆڤ ژێرەوژوور بکات و ببێتە مایەی کارەسات بۆی. دەبێت ئیماندار بەردەوام بە ئاگا بێت، هەردەم بە وریایی مامەڵە بکات و بەردەوام پەنا بۆ خوای گەورە بەرێت هەتا ئەم گوناهانە وەك ئەو مارە ژەهراوییانەی لە یەك ساتدا نێچیرەکانیان دەگەزن و دەیانکوژن، دڵمان نەکوژن و لە دوارۆژدا نەمانکەنە یەکێك لە مایەپووچان.

# ئەی هاوار غەیبەتمان کرد، دەبێت ئێستا چی بکەین؟



"هاوەڵان لە نوێژ و ڕۆژوودا بە دووای پێوەری بەندایەتییدا نەدەگەڕان، بەڵکو لە نەوتنی شتانی نەرێنی دەربارەی مرۆڤەکاندا بە دووایدا دەگەڕان."

شوێنکەوتووە بەڕێزەکان

ئێستا لامان ڕوون بوویەوە کە غەیبەت گوناهێکی چەندە زیانبەخشە و چەندە پێویستە مرۆڤ هێندەی هەڵهاتن لە مار و شامار خۆیی لێ دوور بخاتەوە. بەڵام ئەوە هەیە کە مرۆڤ بونیادێکی گیانی بە گیانی هەیە لەگەڵ هەڵەدا. بۆ ئاماژەکردن بەم ڕاستییە پێغەمبەری خوا دەفەرموێت "هەموو مرۆڤێك هەڵە دەکات، باشترینی هەڵەکارانیش تەوبەکارانن."[1]

١. علي المتقي، كنز العمال ٤/٩٠.

یەکێك لە درەوشانەوەکانی میهرەبانی بێ کۆتای خوای گەورەش بریتییە لەوەی لە کاتی هەڵەکردنماندا دەرفەتی گەڕانەوەمان لەو هەڵەیە پێ دەدات و لە کەموکوڕیمان دەبووریت. شایەت گەر ئەو هەڵە و گوناهانەی ئەنجام دەدرێن نەسڕانایەتەوە و لە هەمان کاتدا سزاکەیان بسەپێنرایە، ژیان دەبووە یەك پارچە سزا.

پەروەردگارمان دەفەرمویت:

﴿وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ﴾ (الحجرات: ١٢)

"کەستان غەیبەتی کەستان مەکەن. کەس لە ئێوە حەز بەوە دەکات قەپاڵ لە لاشەی مردووی براکەی بدات؟ بۆیە یەکسەر بێز لەو کارە بکەنەوە! مادەم وایە لە سزای پەروەردگارتان بترسن و خۆتان لەم کردەوە ناشرینە بپارێزن. خوای گەورە تەووابە، ڕەحیمە (تەوبەکان قەبووڵ دەفەرمویت، خاوەن میهرەبانی و ئیحسانی بێ کۆتایە)"

بەڵێ، جەنابی حەق، چاوەڕێ دەکات کاتێك ئیمانداران غەیبەت دەکەن، پەشیمان ببنەوە و بگەڕێنەوە و پەنا بەرن بۆ میهرەبانی بێ سنووری خوای گەورە. ئەوەی لەم دۆخەدا دەکەوێتە سەر باوەڕداران بێ کات بەفیڕۆدان هەرچی زووتر چاککردنەوەی کاریگەری نەرێنی ئەم گوناهەیە کە پەلاماری دونیای مەعنەوییان دەدات و وێرانکاری بەرچاوی تێدا دەکات.

ئەمەش بەم شێوازانەی لای خوارەوە دەبێت:

## لە پێشدا تەوبە

غەیبەت هەر وەك خواردنەوەی کهول و زیناکردن حەرامە. گوناهێکی وەها بە هەموو شێوەیەك لێپرسینەوەی لەسەر دەکرێت. مەگەر تەوبەی لەسەر کرابێت و پەشیمانیی قووڵی لە بارەوە نیشان درابێت.

لە ڕیوایەتەکاندا دەوترێت کە خوای گەورە بە سرووش بە حەزرەتی موسای فەرمووە "ئەو کەسەی غەیبەت دەکات، کە تەوبەی لەسەر کرد دواین کەس دەچێتە بەهەشتەوە. گەر تەوبەش نەکات و پێداگری بکات یەکەم کەس دەچێتە دۆزەخەوە."[١]

غەیبەت ئەو گوناهەیە کە پەیوەندیدارە بە دوو مافەوە. تێیدا هەم مافی خوا و هەم مافی بەندەش پێشێل دەکرێت. غەیبەت کردن ئەنجامدانی گوناهێکە کە بە ئاشکرا قەدەغە کراوە و لە هەمان کاتدا پێشێل کردنی مافی خواشە. یەکەمین وێستگەی سڕینەوەی ئەو تاوانانەی ئەم مافە لەخۆ دەگرن، تەوبەیە. چونکە یەکەمین هەنگاو بۆ گەڕانەوە لە گوناه تەوبەیە. بەگوێرەی چەشن و چڕیی گوناهەکە، ئەو زمان و دڵەی خەوشی گرتووە، لە دەفری تەوبەدا دەشۆرێت و خاوێن دەکرێتەوە. بە پێی ڕێژەی دڵسۆزیی لەم کردارەدا، دڵ پاراو دەبێت و پاك دەبێتەوە. لەم دیدگایەوە دەبێت ئەو کەسەی غەیبەت دەکات لە پێشدا لە ناخەوە هەستێکی پەشیمانی قووڵی تێدا هەڵگیرسێت و پاشانیش

١. غزالي، إحياء علوم الدين ١٤٢/٣؛ أبشهي، المستطرف ١٩٠/١.

بە ئەسرینەکانی دڵی بشوات و، زمانی پابەندی ئەو گوفتارانە بکات کە لەسەر خولگەی ڕەزامەندی پەروەردگاردان. پێویستە ئەمە ئەنجام بدات تاوەکو شوێنەواری تاوانەکە بسڕێتەوە و جارێکی تریش زمانی لە غەیبەت نەدات و توخنی ئەو گوناهە قێزەونە نەکەوێت.

## دواتر ئیستیغفار بۆ کەسی غەیبەتکراو بکرێت و داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگار بکرێت

پێغەمبەری خوا (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) فەرموویەتی "ئەوەی غەیبەتی برا ئیماندارەکەی بکات و پاشان لە خوای گەورە داوای لێخۆشبوونی بۆ بکات، بۆی دەبێتە کەفارەتی ئەو غەیبەتەی کردوویەتی"[1] بەم شێوەیە ڕێگەچارەیەکمان بۆ ڕزگاربوون لە غەیبەت نیشان دەدات. حەزرەتی بەدیعوززەمانیش دەربارەی واتای ئەم فەرموودەیە پێمان دەڵێت "گەر غەیبەت کرا یان بە مەبەست گوێی بۆ گیرا؛ ئەو کات دەبێت بوترێت "اللهم اغفر لنا ولمن اغتبناه"، واتە "پەروەردگارا! لە ئێمە و ئەوەش کە غەیبەتمان کرد خۆش ببە"، پاشان دەبێت هەر کاتێک بەو کەسە گەیشت کە غەیبەتی کردووە، پێی بڵێت "گەردنم ئازاد بکە."

بە گوێرەی ئەمە پێویستە ئەو کەسەی غەیبەت دەکات، داوای لێخۆشبوون هەم بۆ خۆی و هەم بۆ ئەو کەسەش بکات کە غەیبەتی کردووە.

---

١. أبو نعيم، حلية الأولياء ٢٥٤/٣؛ البيهقي، شعب الإيمان ٣١٧/٥.

لەو کاتەدا کە کەسی غەیبەتکراو ئاگای لەو غەیبەتە نییە کە کراوە، بەشێك لە زانایانی ئیسلام تەوبە و ئیستیغفار بە کیفایەت دەزانن بەڵام زۆرینەشیان پێیان وایە کە پێویستە گەردنئازادی لێ بکرێت. حەزرەتی حەسەن بەسری دەفەرموێت "کەفارەتی غەیبەت، پەسن و سەنا کردنی ئەو کەسەیە کە غەیبەتی کراوە و داواکردنی لێخۆشبوونە بۆی" بەم جۆرە داوای لێخۆشبوون و باسکردنی جوانییەکانی کەسی غەیبەتکراو بە بەس دەزانێت. بە ڕای ئەو پێویست ناکات گەردنئازادی لێ بکرێت.

گەورە موجاهیدێکی تری ئیسلام دەفەرموێت "کەفارەتی خواردنی گۆشتی براکەت، سەناکردن و بەرزکردنەوەیەتی لەگەڵ کردنی نزای خێر بۆ کردنی." بەم وتەیەی دەریدەخات کە هەمان ڕای حەزرەتی حەسەنی بەسری هەیە.

گەر سەرەڕای ئیستیغفار و نزاکردنمان هێشتا هەر دڵمان ئاسوودە نەبوو، دەتوانین بڕۆین و گەردنئازادی لەو کەسە بکەین کە غەیبەتمان کردووە. ئەگەر بزانین کە باسکردنی هەموو شتەکە برینی قووڵ لای لایەنی بەرامبەر دروستدەکات، ئەو کاتە بێ ئەوەی بچینە وردەکارییەوە، ڕاستەوخۆ داوای گەردنئازادی دەکەین. چونکە هەندێکجار لەم دۆخانەدا مەترسی ئەوە هەیە دەرەنجامە خراپەکانی ئەو غەیبەتەی کەدوومانە زیاتر تۆخ بکەینەوە و زیانی زیاتر بگەیەنین، وەك دەڵێن "بۆ ڕیش بچین و سمێڵیش بنێینە بانی".

## باشترین شت ئەوەیە گەردنت بە ئەو کەسە ئازاد بکەیت کە غەیبەتت کردووە

گەر ئەو کەسەی غەیبەتی کراوە، بە بابەتی غەیبەتەکەی زانیبێت، ئەوا لەم دۆخەدا پێویستە داوای گەردنئازادی لێ بکرێت. لەبەر ئەوەی پێغەمبەری ئازیزمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەفەرموویت "هەر کەسێك هەر ناهەقییەکی دەرهەق بە ناموس و شەرەف و شکۆی براکەی ئەنجامدابێت، ئەوا با پێش ئەوەی ئەو ڕۆژە بێت کە دینار و درهەم (پارە و پول) هیچ بەهایەکیان نییە، واتە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی بچێت گەردنی خۆیی پێ ئازاد بکات. ئەگەر (ئەم کارە بکەوێتە دواڕۆژەوە) هەر کردەوەیەکی باشی هەبێت هێندەی ئەو ناهەقییەی ئەنجامیداوە، لێی کەم دەکات. گەر کردەوەی باشیشی نەبوو، لە خراپەکانی ئەو کەسەی غەیبەتی کردووە هەڵدەگیرێت و دەخرێتە سەر خراپەکانی ئەو."[1]

غەیبەت کردن پێشێلکاریی مافی بەندەیە. پێویستە لەم دۆخەدا داوای لێبووردن و گەردن ئازادی لەو کەسە بکرێت. چونکە هەتا کەسی مافخوراو لێت نەبوورێت، ڕزگاربوون لەو گوناهە کارێکی ئەستەمە. خوای پەروەردگار گەر بیەوێت لەو مافانە دەبوورێت کە پەیوەندییان بە خۆیەوە هەیە، بەڵام ئەو کەسەی قسە بە شەرەف و شکۆی کەسێك دەڵێت، دەبێت ئەو مرۆڤە بدۆزێتەوە و ڕووبەڕووی ببێتەوە و قەرەبووی هەڵەکەی بۆ دواڕۆژ هەڵنەگرێت.

---

١. البخاري، المظالم ١١، الرقاق ٤٨؛ الترمذي، صفة القيامة ٢؛ إبن حبان، صحیح ٣٦١/١٦.

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەربارەی غەیبەت دەفەرموێت "وریای غەیبەت بن؛ چونکە غەیبەت لە زینا زبرترە. مرۆڤ زینا دەکات و تەوبە دەکات (گەر دووبارەی نەکردەوە)، خوای تەعالا تەوبەکەی قەبووڵ دەکات. بەڵام ئەوەی غەیبەت دەکات، هەتا لەلایەن کەسی غەیبەت کراوەوە لێی نەبووردرێت، لە گوناهەکەی نابووردرێت."[1]

"غەیبەتی موسوڵمانان مەکەن! هەر کەسێك غەیبەتی برا موسوڵمانەکەی بکات، لە ڕۆژی قیامەتدا زمانی بە پشتەملیەوە دەبەسترێت و بەو جۆرە دەهێنرێتە مەیدان. جا ئەو گرێیە یان بە لێخۆشبوونی خوا یان بە بەخشین لە لایەن کەسی غەیبەتکراوەوە دەکرێتەوە."[2]

وەك لە فەرموودەکاندا زۆر بە ڕوونی هاتووە، کە غەیبەت دەکرێت و مافی بەندە پێشێل دەکرێت، گونجاوترین شت کە بکرێت داوای گەردن ئازادییە لە کەسی غەیبەتکراو و داواکردنی لێخۆشبوونی خوایە بۆی.

لە کاتی گەردنئازادیدا گرنگترین خاڵ کە پێویستە سەرنجی بدەین بریتییە لەوەی ئەم داواکارییە بە هەستێکی دڵسۆزانەوە بهێنینە سەر زار. ئەو وتانەی کە مۆری ڕاستگۆیانەی ویژدانیان پێوە نییە نە لەلای لایەنی بەرامبەر بایەخی هەیە، نە لەلای پەروەردگار. بۆیە دەبێت بە گەرموگوڕترین هەستەوە داوای گەردنئازادی لە لایەنی بەرامبەر بکرێت.

لێرەدا با وەبیرهێنانەوەیەکی بچوك بۆ ئەو کەسە بکەین کە غەیبەتی

---

١. الطبراني، مجمع الأوسط ٣٤٨/٦.

٢. علي المتقي، كنز العمال ٢٣٥/٢.

کراوە. لێبووردەیی فەزیلەتێکی تا بڵێیت گەورەیە و لە مرۆڤە کامڵەکان دەوەشێتەوە. پێغەمبەری خوا ئاماژە بەوە دەکات کە یەکێك لە دەرگاکانی بەهەشت تایبەت کراوە بەو مرۆڤانەی ئیرادەی لێبووردەییان بەرامبەر بەوانە خستووەتە گەڕ کە ستەمیان لێ کردوون.[1] خۆی لە خۆیدا ئەو کەسەی غەیبەت دەکات، بە ئەنجامدانی ئەو گوناهە خۆی خستووەتە پێگەیەکی دیاریکراوەوە. ئەو کەسەش کە غەیبەتی دەکرێت بە لێخۆشبوون و گەردنئازادکردن هەم چاکەی بۆ دەنووسرێت، هەم ئەم هەڵوێستەی لەلایەن خەڵکەوە بەرز دەنرخێنرێت. لێبووردەیی ڕەوشتێکی خواییە و ئەو شێوازی هەڵسوکەوتەیە کە خۆی بەردەوام ئامۆژگاری ئیماندارانی بۆ دەکات.

حەزرەتی حەسەنی بەسری (رضي الله عنه) دەڵێت "کاتێك لە مەحشەردا ئوممەتەکان لەبەردەم پەروەردگاردا چۆك دادەدەن، دەنگێك دەڵێت "کێ پاداشتی لەلای خوای گەورە هەیە با هەستێتە سەر پێ!". تەنها ئەو کەسانەی لە دونیادا لێبووردەییان کردووەتە دروشم، وەڵام دەدەنەوە و هەڵدەستنە سەر پێ."[2]

لە ژیانی پیرۆزی مامۆستا بەدیعوززەماندا یادگارییەکی خۆش هەیە. ڕۆژێکیان قوتابییەکانی مامۆستا دەرگای ژووری مزگەوت بە کراوەیی بەجێدەهێڵن. ژوورەوەش کوپەیەکی لێ دەبێت کە قاورمەی گۆشتی تێدایە. سەگێك دەچێتە ژوورەوە و سەردەکاتە سەر کوپەکە و قاورمەکەی ناوی دەخوات. پاش ئەوەی سکی خۆی بە باشی تێر

---

١. علي المتقي، كنز العمال ٢٠٨/٣؛ أبن حجر، فتح الباري ٢٨/٧.

٢. القرطبي، الجامع لأحكام القرآن ٤/٦؛ أبو نعيم، حلية الأولياء ٢٠٤/٩.

دەکات، دەیەوێت سەری لە کوپەکە دەربێنێت بەڵام ناتوانێت. بۆیە دەیدا بە ڕاست و چەپدا و هەر چۆنێك بێت کوپەکە دەشکێنێت و ڕادەکات.

قوتابییەکانیش کە هەواڵەکە دەبیستن، زۆریان پێ ناخۆش دەبێت. بڕیار دەدەن هەرچۆنێك بووە سەگەکە بگرن و لێدانێکی باشی لێبدەن. کاتێك حەزرەتی بەدیعوززەمان هەواڵی ئەمە دەبیستێتەوە، ڕاستەوخۆ خۆی لەسەر بابەتەکە دێتە گۆ. مەلا ڕەسوڵ وەك بەرگرییەك دەڵێت "سەیدا کەمێك گۆشتمان هەبوو. ئێمە دڵمان نەدەهات بیخۆین بەڵام سەگێك هاتووە و هەم گۆشتەکەی خواردووە، هەم کوپەکەشی شکاندووین. ئیدی چۆن لێینەدەین؟" مامۆستاش ئەم پرسیارانەی ئاڕاستە دەکات "بە ویژدانت وەڵام بدەرەوە: وەك مرۆڤێکی خاوەن ژیری و دەرك، گەر سوور بزانیت ئەم گۆشتە خاوەنی هەیە، برسیت بێت و پارەت پێ نەبێت و لە تواناشتدا نەبێت شتێك بۆ خواردن بکڕیت و دواجار لە شوێنێکی کراوەدا گۆشت بدۆزیتەوە، دەیخۆیت یان نا؟"

مەلا ڕەسوڵیش پاش ماوەیەك بێدەنگی، دەڵێت "بەڵێ!". مامۆستا بەم جۆرە بەردەوام دەبێت لە وتەکانی "ئەمە لە کاتێکدا ئەم سەگە ئاژەڵێکە، ژیریی نییە. حەرام و حەڵاڵ نازانێت؛ خێر و شەڕ ناناسێت؛ ناشزانێت کە خاوەنەکەی لێی دەدات. بۆیە شتێکی تا بڵێیت ئاساییە کە لە دەرگای کراوەوە هاتووەتە ژوورەوە و گۆشتەکەی خواردووە. ئایا لەبەر ئەمە سزای ئەم ئاژەڵە دەدرێت؟ لە ئێوە دەپرسم، دەست بخەنە سەر ویژدانتان ئینجا وەڵامم بدەنەوە."

پاش ئەم ڕوونکردنەوانە مەلا ڕەسوڵ و هاوڕێکانی بێجگە لە قەبووڵکردنی ئەوەی کە سەگەکە بێ تاوانە، چارەیەکی تریان بۆ نامێنێتەوە.

مامۆستاش بەم شێوەیە کۆتایی بە قسەکانی دەهێنێت "مادەم تاوایە. غەیبەتی ئەم ئاژەڵە مەکەن و لێی ببوورن!"

مەلا ڕەسوڵ نزیکی لە مامۆستاوە، وەك سەرمایەیەك تەماشا دەکرد، بۆیە بە دەم خەندەوە وەڵامی دایەوە "لە دڵەوە نەمان دەویست لێی ببوورین سەیدا، بەڵام تۆ قایلت کردین."

ئەم ڕووداوە خۆش و پەند ئامێزە بەسەر کەسێکدا هاتووە کە لە ژیانیدا بە هیچ جۆرێك ڕێی بە غەیبەت نەداوە یادگارییەکی شیرین و جوانە وەك تابلۆیەکی ئەنجام نەدانی غەیبەت و گەردنئازادی کردن لە کاتی غەیبەت کردندا.

لەم دەمەدا کە هاتووینەتە سەر ئەوەی پوختەی پەیامەکەمان بگەیەنین، هەم وەك خیتامی میسك و هەم بە نیەتی داوای لێخۆشبوون لەسەر ئەو غەیبەتانەی تا ئەمڕۆ کردوومانە، کۆتایی کتێبەکەمان بەم نزایانە دەهێنین.

"ئەی ئەو پەروەردگارەی بۆ بینینمان دوو چاو و بۆ تەرجومانی دڵمان زمان و لێوەکانت پێ بەخشیوین! داوات لێ دەکەین کە هەردەم زمانمان بکەیتە زمانی پاڕانەوە و، دڵەکانمان بکەیتە ئەو دڵانەی کە هەردەم بە خۆشەویستی و یادی تۆوە لەرزەیانە. ئاسۆی دڵەکانمان واڵا بکە و زمانمان وابەستەی ڕاستی بکە! بمانکە بە قومرییەکانی

باخچەی تایبەتەکەت و لە ڕێگەی ناساندنی تۆدا هەناسەیەکی پێکۆتا و وەنگێکی نەبڕاوەمان پێ لوتف بفەرموو!

پەروەردگارا! پەنات پێ دەگرین لەو زمانەی تۆ نایناسێنێت و لەو ئاوازەی تۆ ناچڕێت. ئەوەمان بە نسیب بکە کە هەردەم زمانمان لە ڕێی ڕەزامەندی تۆدا بەکاربهێنین! لە قسەکردنی درۆ و گەواهیدانی درۆ و قسەی پاشەملە و غەیبەت و سەرجەم ئەو گوناهانەی بە ئافاتی زمان هەژمار دەکرێن، بەدوورمان بکە! ئیرادەی ئەوەمان پێ لوتف بفەرموو کە هەم زمانەکانمان و هەم دڵەکانمان چاك بکەین و بیانپارێزین لە خراپە و بە بەهەشتی خۆت شەرەفمەندمان بکە.

ئەی خوای گەورەمان! تەمەنی فانیمان بە صوحبەتی خۆت نەمر بفەرموو! لەو کۆڕانەدا ڕامان مەگرە کە لێوانلێون لە لاقرتی و دوور لە یادی تۆ! لە دڵماندا هەستە خراپەکانی وەك کینە و حەسوودی و بەدگومانی بەرامبەر ئیمانداران داڵدە مەدە! برایەتی و دۆستایەتی و خۆشەویستیمان لەگەڵ براکانماندا زیاد بکە! بە ڕادەیەك بمانکە بە دڵسۆز و هاوسۆز، کە ببینە ئاوێنەی یەکدی و هێندەی دووری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لە گوناهێکی دووڕووانەی وەك غەیبەت دوورمان بخەرەوە!

ئەی سوڵتانی خاوەن کەرەم و میهرەبانی بێ کۆتا! گەر پێمان خلیسکا و زمانمان کەوتە گوناهەوە هەم لە ئێمە و هەم لەو برایانەمان کە غەیبەتمان کردوون، خۆش ببە! بمانپارێزە لە دووبارە کەوتنەوە نێو ئەو چاڵەی کە پێشتر تێیکەوتووین و هەمووومان بکە بە یەکێك لەو بەندانەی کە زمانیان گرتووە و ڕزگاریان بووە! (ئامین)".

- خوای گەورە چ بەڵێنێکی داوە بەو کەسانەی کە سەرکەوتوون لە کۆنترۆڵکردنی زمانیان و زمانیان لە لە ڕێگەی خێردا بەکاری دەهێنن؟

- بۆچی برینی زمان سارێژ نابێت؟

- غەیبەت چییە، چی نییە؟

- لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکاندا چۆن وێنەیەك بۆ غەیبەت کێشراوە؟

- بۆچی نەخۆشی غەیبەت بە شێوەیەکی زۆر بەربڵاوە؟

- ئەو کەسانەی کە لە شوێنانێکدا ئامادەن کە غەیبەتی تێدا دەکرێت، گوناهبار دەبن؟

- چۆن خۆمان پاك بکەینەوە لە پیسی و ناشرینی گوناهی غەیبەت؟

نرخی ٣٥٠٠ دیناره

9 649750 000109
Dilini Tutan Kurtuldu

IRFAN
PUBLISHING